# هاتنی مەهدی

## لە فەرموودە و آثردا

نوسینی

لێکۆڵەر ئەبی عبداللە کوردستانی

ئامادەکردنی

خـادم الإســــــــلام

١٤٤١ کۆچی

٢٠٢٠ زاینی



## پێشەکیەک بۆ چوونە نێو باسەکە

هاتنی مەهدی یان موژدەی هاتنی مەهدی زیاتر لە هەزار ساڵە لەلایەن زاناکانەوە گرینگی پێدراوە و، یەکێکە لە باسە کێشە لەسەرەکان، هەر لەکۆنەوە تا ئێستاشی لەگەلدا بێت. ئەمیش بەهۆی ئەوەی کەسانێک هەبوون ڕەفزی کولی ئەم باسەیان کردووە. هەروەها بگرە زۆرێک ئێستاش بە خورافەی دادەنێت و، لەبەرامبەریدا بەردەوام کۆمەڵێکی حەق ویست هەبوون وەڵامی گومانەکانیان داوەتەوە. چی بەنامیلکە یان بەکتیب بێت. هەروەها لەهەر سەردەمێکدا ستەم بەرامبەر بەموسڵمان گەیشبێتە لووتکە، باسەکە کراوە. یان کاتێک کە ئەمیرێکی عادل و مقسط واتە دادپەروەر و چاکەکار هاتبێت، بەشێک لەزانایان وەسفیان کردووە بە مەهدی. بۆ؟

چونکە یەکێک لە کارەکانی مەهدی ئاخیر زەمان زەوی پڕ دەکات لە چاکە و دادپەروەری. هەروەها مەهدی ئەوە نەبێت تایبەت بێت بە گروپ و کۆمەڵەیەکەوە، بەڵکو گشتییە و تەنانەت

شیعەی ڕافیزیش زۆر دڵیان بەمەهدی خۆشە. بەڵام وەک مەعلومە ئەوان پشتیان بە خورافە بەستووە نەک حەقیقەت.

هەروەها ئەم باسە لەلایەن زاناکانەوە گرینگییەکی زۆری پێدراوە و، زۆرێکیان کتێبیان لەسەر نوسیووە، تەنانەت ئیمامی أبو داود لە سننە بەنێو بانگەکەی کە لەڕیزبەندی سێیەمی کتب الستە و تسعەیە. کتێبی تایبەتی بەناوی مەهدی داناوە کە ١٢٠٠ ساڵ پێش ئێستایە.

بۆیە من هەوڵدەدەم بە تەفاصیلی باسی بکەم. هەروەها وەڵامی سەرجەم گومەکانیش لەسەر مەهدی بدەمەوە پشتیوان بە الله. ئنجا زۆرترین فەرموودە و کتێبی تێدا بەکاربێنم چونکە ئێستا بارودۆخ جیاوازە لەهەموو کاتێک. لایەنی کەسی و زەمانی و مەکانی باسبکەم و ڕوونی بکەمەوە. چونکە هاتنی مەهدی گەورەترین موژدەیە بۆ ئەهلی ئیمان. کۆتا نیشانەی بچووک و سەرەتای نیشانە گەورەکانە واتە کلیکی کردنەوەی دەرگای نیشانە گەورەکانە.

بۆیە زۆر گرینگە باسەکە بگەڕێنمەوە سەر شێوە واقعیەکەی خۆی. بەمشێوەیە بابەتی مەهدی دەیان فەرموودەی لەسەر

هاتووه بە پلەی صەحیح و حەسەن و ضەعیف و مەوضوع.
وەڵامی ئەو گومانەش دەدەینەوە کە دەڵێن (لا مهدی إلا عیسی إبن مریم) پشتیوان بە الله.

**٦ی ڕەجەبی ١٤٤١ کۆچی**

**بەرامبەر بە ١ی ئازاری ٢٠١٩**

**✍ ئەبی عبدالله کوردستانی**

## باسی مەهدی لە کتێب و لای زانایان.

ئەم بەشە وەک وەڵامی ئەو گومانانەیە کە دەڵێن مەهدی خوڕافەیە و شتێک نییە بە ناوی مەهدی یەوە. بۆیە دەمەوێت ناوی بەشێک لە صەحیح و سونەن و موسەنەد و موصەنەف و موعەجەم و تاریخی زانایان بنوسم کەوا فەرموودە و ئەثەریان لەسەر مەهدی هێناوە لەکتێبەکانیان.

١- أبو داود في سننه.
٢- الترمذي في جامعه.
٣- ابن ماجه في سننه.

٤- النسائي ذكره السفاريني في لوامع الأنوار البهية والمناوي في فيض القدير وما رأيته في الصغرى ولعله في الكبرى.

٥- أحمد في مسنده.

٦- ابن حبان في صحيحه.

٧- الحاكم في المستدرك.

٨- أبو بكر بن أبي شيبة في المصنف.

٩- نعيم بن حماد في كتاب الفتن.

١٠- الحافظ أبو نعيم في كتاب المهدي وفي الحلية.

١١- الطبراني في الكبير والأوسط والصغير.

١٢- الدارقطني في الأفراد.

١٣- البارودي في معرفة الصحابة.

١٤- أبو يعلى الموصلي في مسنده.

١٥- البزار في مسنده.

١٦- الحارث بن أبي أسامة في مسنده.

١٧- الخطيب في تلخيص المتشابه وفي المتفق والمفترق.

١٨- ابن عساكر في تاريخه.

١٩- ابن منده في تاريخ أصبهان.

٢٠- أبو الحسن الحربي في الأول من الحربيات.

٢١- تمام الرازي في فوائده.

٢٢- ابن جرير في تهذيب الآثار.

٢٣- أبو بكر بن المقري في معجمه.

٢٤- أبو عمرو الداني في سننه.

٢٥- أبو غنم الكوفي في كتاب الفتن.

٢٦- الديلمي في مسند الفردوس.

٢٧- أبو بكر الإسكاف في فوائد الأخبار.

٢٨- أبو الحسين بن المناوي في كتاب الملاحم.

٢٩- البيهقي في دلائل النبوة.

٣٠- أبو عمرو المقري في سننه.

٣١- ابن الجوزي في تاريخه.

٣٢- يحيى بن عبد الحميد الحماني في مسنده.

٣٣- الروياني في مسنده.

٣٤- ابن سعد في الطبقات.

٣٥- ابن خزيمة.

٣٦- الحسن بن سفيان.

٣٧- عمر بن شبه.

٣٨- أبو عوانة.

ئەمانەم لە کتێبی (عقيدة أهل السنة والأثر في المهدي المنتظر). نوسەرەکەی بەناوی "عبد المحسن العباد". ئنجا هەم دیسان باسی بەشێک لەو زانایانە دەکەم کە کتێبی تایبەتیان لەسەر مەهدی داناوە.

١. أبو بكر ابن خيثمة زهير بن حرب، ئەمە یەکێکە لە زانا کۆنەکان.

٢. الحافظ أبو نعيم الأصبهانی، بەناوی چل فەرموودە لەسەر مەهدی.

٣. هەروەها سیوطی لە کتێبی (العرف الوردي في أخبار المهدي).

٤. هەروەها حافظ إبن كثير لە کتێبی (النهاية) کۆمەڵێکی تایبەت بەفەرموودەی لەسەر مەهدی هێناوە.

٥. هەروەها الفقيه بن حجر المكي لەکتێبەکەی بەناوی (القول المختصر في علامات المهدي المنتظر).

٦. هەروەها ملا علي قاري کتێبەکەی بەناوی (المشرب الوردي في مذهب المهدي).

٧. هەروەها مرعي بن يوسف الحنبلي بەناوی (فوائد الفكر في ظهور المهدي المنتظر).

٨. هەروەها قاضی محمد بن علي الشوكاني، کە زانایەکی گەورەیە کتێبەکەی بەناوی (التوضيح في تواتر ما جاء في المهدي المنتظر والدجال والمسيح).

٩. هەروەها أمير محمد بن اسماعيل الصنعاني، خاوەنی (سبل السلام). هەروەها بەرزنجی لە کتێبی (الإشاعة)، هەروەها شێخ حمود التويجری، هتد...

زاناکان گەلێک زۆرن ئەمانە هەریەکە و لە زەمەن و کاتێکی جیاوازبووە، واتە سەلەف و خەلەف بوونە، نەک بڵێین سەلەف باسیان نەکردبێت تەنیا خەلەف هاتبن گرنگیان پێی دابێت. بۆیە ئەمانە گرنگی باسی مەهدیمان بۆ دەردەخەن و ڕەدد یان وەڵامی گومانەکانیش لەسەر خورافەبوونی ئەم بابەتە گرنگە دەدەنەوە.

## مەهدی پلەی تەواتری مەعنەوی هەیە.

پشتیوان بە الله ناوی هەندێک زانا دەخەینەبەر دیدی خوێبەران کەوا قسەیان لەسەر ئەوە کردووە کە بابەتی مەهدی و هاتنی خەلیفەیەک لەکۆتا زەمان و پێش دەججال، گەیشتووە بە پلەی تەواتری مەعنەوی. بەهۆی زۆری ڕێگا و ڕیوایەتەکان کە

لەسەری هاتوون. هەروەها ئیمان هێنانیش بەم باسە غەیبیە لەلایەن زانایان چی لە سەلەف و چی لە خەلەف یەکێکە لە بابەتە بیروباوەڕییەکان، چونکە مەجالی ڕەدکردنەوەی نییە.

## بەکورتی واتای تەواتر چییە لە حەدیث؟

واتە بابەتێک بەچەندان ڕێوایەتی جۆراوجۆر هاتبن. واتە مەرجە بۆ بوونە تەواتر یان پلەی تەواتر کە ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵ ڕیواتیان کردبێت و، ئنجا لە حەدیث تەواتر بەهێزترین سەنەدە. چونکە زۆری ڕیوایەتی کەسەکان باسەکە بەهێزدەکات و پتەوی دەکات لەسەنەد. هەروەها تەواتری مەعنەوی واتە بابەتێک بەچەندەها ڕیوایەتی جیاواز هاتبن، مەعنا یان واتایان یەک بێت واتە لەماناادا یەکبگرنەوە، ئەمە بەکورتی.

ئنجا بابەتی مەهدیش بەشێکی زۆر لەزانایان لەسەردەم و کاتی جیاوازەوە باسی مەهدیان بە تەواتر داناوە و دەڵێن پلەی تەواتری مەعنوی هەیە. وەک ئەمانەی خوارەوە:

١. الحافظ أبو الحسن محمد ابن الحسين الآبري السجزي خاوەنی (كتاب مناقب الشافعي) ئەم زانایە لەسالانی سێ سەدی کۆچی وەفاتی کردووە. واتە سەلەفە، دەڵێت: مەهدی

گەیشتووە بەپلەی موتەواتر. لەناو ئەم ئوممەتە دەردەچێت و زەوی پڕدەکات لەدادگەری و چاکە. هەروەها حەوت ساڵ حوکم دەکات و عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەدوای ئەم دادەبەزێت و یارمەتی دەدات لەکوشتنی دەججال و، نوێژیش لەدوای دەکات.

٢. محمد بەرزنجی، لەساڵانی هەزار و سەدی کۆچی وەفاتی کردووە لە کتێبێکی بەناوبانگی بەناوی (الإشاعة في أشراط ساعة) لەبابی سێیەم لەنیشانە گەورەکان و ڕووداوەکان، یەکێک لەوانە مەهدییە کە دەڵێت: (بلغت حد التواتر المعنوي فلا معنى لإنكارها). دوای کورتە باسێک دەڵێت: گەیشتووە بە پلەی تەواتری مەعنەوی کەوا ئینکاری لێناکرێت.

٣. الشيخ محمد السفاريني لە ساڵانی ١١١٤- ١١٨٨ کۆچی. لەکتێبەکەی بەناوی (لوامع الأنوار البهية)دا دەڵێت: وقد كثرت بخروجه -يعني المهدي- الروايات حتى بلغت حد التواتر المعنوي.

واته باسی مەهدی گەیشتووە بەپلەی تەواتری مەعنەوی و ئنجا دەڵێت: فالإيمان بخروج المهدي واجب كما هو مقرر عند أهل العلم ومدون في عقائد أهل السنة والجماعة.

واته بڕوابوون بەدەرچوونی مەهدی واجبە، هەروەک چۆن لەلایەن ئەهلی عیلمەوە دووپاتکراوەتەوە.

٤. القاضي محمد بن علي الشوكاني، لەساڵانی هەزار و دووسەد و پەنجادا وەفاتی کردووە. خاوەنی کتێبی (نيل الأوطار)ە، له کتێبی (التوضيح في تواتر ما جاء في المهدي المنتظر والدجال والمسيح)دا دەڵێت: والأحاديث الواردة في المهدي التي أمكن الوقوف عليها منها خمسون حديثا فيها الصحيح والحسن والضعيف المنجبر وهي متواترة بلا شك ولا شبهة بل يصدق وصف المتواتر.

٥. هەروەها حافظ جلال دين سيوطی، له کتێبی (عرف الوردی)دا ئەقوالی چەندەها زانای سەلەف و خەلەفمان بۆ دەگوازێتەوە لەسەر پلەی تەواتری باسی مەهدی.

ئنجا ئەمانەی سەرەوەی باسم کرد له کتێبی (صواعق) ابن حجر الهیثمی، دان بەپلەی تەواتری مەهدیدا دەنێن.

ئەمە لەکتێبی (عرف الوردی فی أخبار المهدی) لەسەرەتای باس.

ئەو فەرموودانەی لەسەر مەهدی هاتوون ژمارەیان دەگاتە پەنجا فەرمووده بە صەحیح و حەسەن و ضەعیفەوە کە پلەی تەواتری هەیە بەبێ هیچ گومانێک. ئەمە تەنیا فەرمووده جگە لە ئەثەر.

بێگومان زۆرێکی تر لەزانایان دووپاتی ئەوەیان کردووەتەوە لەزۆرینەی سەردەمەکان. ئەوەی گرنگە کە ئەم بابەتە بڕواتەوە لەپلەی سەنەد تاگەیشتووە بە پلەی تەواتری مەعنەوی، ئنجا باوەڕهێنان بەدەرچوونی واجبە.

## باسی مەهدی لەقورئاندا.

ئایا زانایان چۆن تەفسیریان بۆ مەهدی کردووە؟ کێن ئەو زانا و موفەسیرانەی کە تەفسیریان لێکداوەتەوە بە مەهدی؟

**١. ئیمامی جریر بن طبری**

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لەبارەی سزای دنیەویەوە دەڵێت: بەدەرچوونی مەهدی دەبێت. واتە هیچ کەسێک نامێنێت، هەر دەبێت داخڵی ئیسلام ببێت.

تەفسیری ئایەتی ١١٤ی سورەتی البقرة ﴿لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٌ﴾.
واتە الله سزای ڕیسواکەر و زەلیلیان توش دەکاتن لە دنیا. ئەمە جگە لە سزا گەورەکەی قیامەت.

حَدَّثَنَا الْحَسَن, قَالَ: ثنا عَبْد الرَّزَّاق, قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَر, عَنْ قَتَادَة: {لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٌ}. قَالَ: يُعْطُونَ الْجِزْيَة عَنْ يَد وَهُمْ صَاغِرُونَ.[١]

حَدَّثَنَا مُوسَى , قَالَ: ثنا عَمْرو, قَالَ: ثنا أَسْبَاط, عَنْ السُّدِّيّ قَوْله: {لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٌ} أَمَّا خِزْيهمْ فِي الدُّنْيَا: فَإِنَّهُمْ إِذَا قَامَ الْمَهْدِيّ وَفُتِحَتْ القسطنطينية قَتَلَهُمْ , فَذَلِكَ الْخِزْي.[٢]

واتە دەڵێت: لەبارەی {لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٌ} کاتێک کەوا جزیە دەدەن و ملکەچیش دەبن. هەروەها لە (سدی)یەوە بۆمان

---

(١) طبري: ١٥١٧

(٢) طبري: ١٥١٨

دەهێنێت بەوەی کەوا (خزيهم في الدنيا) کاتێک مەهدی دەردەچێت و قوستەنتینیەش ئازاد دەکات و دەیانکوژێت.

## ٢. ئیمامی حافظ إبن كثير

بەهەمان شێوە ئیمامی إبن كثير دیسانەوە لە تەفسیری ئەم ئایەت واتە ئایەتی ١١٤ی سورەتی البقره.

هەروەک چۆن شێخی موفەسیرین ئیمامی طبری تەفسیری ئەم ئایەتی بە دەرچوونی مەهدی دەناسێنێت، بەهەمان شێوەش ئیمامی موفەسیری ئیسلام إبن كثير هەر بەدەرچوونی مەهدی دەناسێنێت. قال تعالى: ﴿لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ﴾ واتە سزایەکی سەرشۆرکەریان دەبێت لە دنیا.

﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمۡ أَن يَدۡخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَۚ لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١١٤﴾[١].

---

(١) سورەتی البقرة: ١١٤

**تەفسیری إبن كثیر:** وَفَسَّرَ هَؤُلَاءِ الْخِزْيِ مِنْ الدُّنْيَا بِخُرُوجِ الْمَهْدِيّ عِنْد السُّدِّيّ وَعِكْرِمَة وَوَائِل بْن دَاوُد وَفَسَّرَهُ قَتَادَة بِأَدَلْجِزْيَة عَنْ يَد وَهُمْ صَاغِرُونَ.

واتە ئەمانە ئەم ئایەتەیان بەدەرچوونی مەهدی لێکداوەتەوە ئەمانیش، السدي و عكرمة و وائل بن داود.

### ٣. ئیمامی إبن كثیر

دیسانەوە إبن كثیر لە تەفسیری ئایەتی ٥٥ی سورەتی النوردا. وقال تعالى: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾.

لێرەدا ئەم ئایەتە بەر لە هاتنی قیتال بوو دژی موشریکان. دواتر الله سەریخستن بەسەر کافرانی جیهاندا و، لەسەردەمی هەر چوار خەلیفەکەدا زۆربەی زەوی فەتح کرا. ئنجا لەکۆتایدا جارێکی تر هەموو زەوی دەکەوێتەوە دەستی موسڵمانان، ئەویش بە دەرچوونی مەهدی دەبێت.

**تەفسیری ابن كثیر:** وَوَقَدْ وُجِدَ مِنْهُمْ أَرْبَعَة عَلَى الْوَلَاء وَهُمْ أَبُو بَكْر ثُمَّ عُمَر ثُمَّ عُثْمَان ثُمَّ عَلِيّ (ﷺ) ثُمَّ كَانَتْ بَعْدهمْ

فَتْرَة ثُمَّ وُجِدَ مِنْهُمْ مَنْ شَاءَ الله ثُمَّ قَدْ يُوجَد مِنْهُمْ مَنْ بَقِيَ فِي الْوَقْت الَّذِي يَعْلَمهُ الله تَعَالَى وَمِنْهُمْ الْمَهْدِيّ الَّذِي اِسْمه يُطَابِق اِسْم رَسُول الله (ﷺ) وَكُنْيَته كُنْيَته يَمْلَأ الْأَرْض عَدْلًا وَقِسْطًا كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا.

واتە هەر چوار خەلیفەکە أبوبکر و عمر و عثمان و علی، الله لێیان ڕازی بێتن. ئنجا دوای ئەوان ماوەیەک دێت تا لەکۆتاییدا الله دەیزانێت کاتەکەی چەندە، مەهدی دێت کەوا ناوی هاوشێوەی ناوی پێغەمبەرە و کونیەی هەمان کونیەی ئەوی هەیە. زەوی پڕ دەکات لە دادگەری و چاکە هەروەک چۆن پڕ بوو بوو لە ستەم و زۆرداری.

لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا، ئیمامی إبن کثیر ئاماژە بەوە دەکاتن کە مەهدی ناوی و ناسراوی واتە کونیەی موطابقە لەگەڵ رسول الله (ﷺ).

### ٤. ئیمامی قرطبی

یەکێکی تر لە ئیمامە موفەسیرە گەورەکانی ئیسلام لەتەفسیری ئایەتی ٣٣ی سورەتی التوبەدا. ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ

رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ﴿٣٣﴾. ئەم ئايەتە تەفسير دەكاتن بەهاتنى مەهدى.

الذي أرسل رسوله بالهدى ودين الحق ليظهره على الدين كله ولو كره المشركونقوله تعالى: {﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ} يريد محمدا (ﷺ). {بِٱلۡهُدَىٰ} أي بالفرقان. {وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ} أي بالحجة والبراهين. وقد أظهره على شرائع الدين حتى لا يخفى عليه شيء منها، عن ابن عباس وغيره. وقيل: {لِيُظۡهِرَهُۥ} أي ليظهر الدين دين الإسلام على كل دين. قال أبو هريرة والضحاك: هذا عند نزول عيسى (عَلَيْهِ السَّلَامُ). وقال السدي: ذاك عند خروج المهدي، لا يبقى أحد إلا دخل في الإسلام أو أدى الج.

قرطبى دەڵێت: ئەوەی کەوا پێغەمبەری ناردووە بە هیدایەت و حەق بۆئەوەی دینی ئیسلام بەرپا بکات بەسەر هەموو دینەکانی تر، گەرچی موشریکانیش پێیان ناخۆش بێتن.

دەڵێت: {ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ} مەبەستی محمد (ﷺ) {بِٱلۡهُدَىٰ} بەجیاکەرەوەی حەق و پوچ، مەبەست قورئانە.

بەبەڵگە و بورهانی ڕوون و ئاشکرا تاوەکو شەریعەتەکەی زاڵ بێت و، هیچ شتێک نەمێنێتەوە بەشاراوەی. هەروەک إبن عباس دەڵێت: واتە دینی ئیسلام.

هەروەها ئەبو هرێرە و ضحاك دەڵێن: ئەمە لەکاتی دابەزینی عیسایە (عَلَيْهِ السَّلَامُ).

هەروەها سدی دەڵێت: لەکاتی دەرچوونی مەهدی کەوا هیچ کەس نامێنێت هەر دەبێت بێتە نێو بازنەی ئیسلامەوە.

ئەمە لێکدانەوە و تەفسیری بەشێک لەزانایانی سەلەف بوو بۆ هەندێک ئایەتی قورئان، بەوەی کەوا دانیان بەهاتنی مەهدی ناوە و باسیان کردووە. ئەمەش ڕەددێکی گەورەیە بۆئەوانەی ئینکاری باسی مەهدی دەکەن، چونکە یەکەم ئەمانە بەشێکیان تابعین بوونە و لەچینی خیر القرون بوونە. هەروەها بەشێکیان موفەسیری گەورە و دیارن وەک ئیمامی طبری کەوا سەلەفە و بە ئیمامی "المفسرين" ناودارە. هەروەها إبن کثیر و قرطبی ئەمانە زانای دیارن.

## مەهدی له صەحیحەیندا.

زۆرێک گلەیی و ڕەخنەی ئەوە دەگرن، گەر مەهدی هێندە گرنکە، بۆچی ئیمامی بوخاری و موسلیم نەیان هێناوە. بەڵام چەند فەرموودەیەک هەیە کەوا لە بوخاری و موسلیم هاتوون بەشێکی زۆری لەزانایان دەڵێن مەبەست پێی مەهدییە ئەمانیش:

١. ئیمامی بوخاری هێناویەی لە (باب نزول عیسى بن مريم) له أبى هريرەوە (﵁) قال: قال رسول الله (ﷺ): "كيف أنتم إذا نزل عيسى بن مريم فيكم وإمامكم منكم".

دەبێت ئێوە چۆن بن کاتێک عیسای کوڕی مەریم دادەبەزێت، هەروەها ئیمام و پێشەواکەش لە ئێوەیە.

٢. عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ الله (﵁) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: "لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. قَالَ: فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ (ﷺ)، فَيَقُولُ أَمِيرُهُمْ: تَعَالَ صَلِّ لَنَا، فَيَقُولُ: لَا، إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ أُمَرَاءُ، تَكْرِمَةَ اللَّهِ هَذِهِ الْأُمَّةَ"(١).

---

(١) ئیمامی موسلیم هێناویەتی

جابری کوڕی عبدالله (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست دەیفەرموو: بەردەوام کۆمەڵێک لە ئومەتەکەم لەسەر حەق سەرکەوتووانە دەجەنگن تا ڕۆژی قیامەت. ئنجا عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێت) دادەبەزێت. سەر لەشکرەکەیان دەڵێت: وەرە نوێژمان بۆ بکە، دەڵێت: نا، ئێوە هەندێکتان لەناو خۆتاندا سەرپەرشتیاری هەندێکتانن. ئەمەیش ڕێز لێنانێکی خوایە.

٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: "كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ، فَأَمَّكُمْ مِنْكُمْ". فَقُلْتُ لِابْنِ أَبِي ذِئْبٍ: إِنَّ الْأَوْزَاعِيَّ حَدَّثَنَا عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: "وَإِمَامُكُمْ مِنْكُمْ". قَالَ ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ: تَدْرِي مَا "أَمَّكُمْ مِنْكُمْ؟" قُلْتُ: تُخْبِرُنِي، قَالَ: فَأَمَّكُمْ بِكِتَابِ رَبِّكُمْ تَبَارَكَ وَتَعَالَى وَسُنَّةِ نَبِيِّكُمْ (ﷺ)[1].

أبو هريره (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: حاڵتان چۆن دەبێت کاتێک کوڕی مریم دادەبەزێتە ناوتان و، پێشەواکەشتان لە خۆتانە. ڕاوی دەڵێت: بە

(١) بخاري / الأنبياء/ ٣٢٦٥

"إبن ذنب" ــم وت: کە "الاوزاعی" قسەی بۆ کردووم لە "الزهراوی"یەوە، ئەویش لە "نافع"ەوە، ئەویش لە أبو هریرەوە فەرموودەکە بەمشێوەیە (و أمکم منکم). "إبن أبی ذئب" دەڵێت: دەزانیت مانای (أمامکم منکم) چییە؟ وتم: پێم بڵێ. وتی: پێشەوایەتیتان دەکات بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەتان.

ئەم فەرموودانە دوو دیویان هەیە، یەکێکیان پەیوەندی بەدابەزینی عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) هەیە، ئەویتریان بە مەهدی هەیە. فەرموودەی ترمان هەیە کە "الحارث ابن أبي" هێناویەتی لە، مسندە بسندە: عن جابر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قال: قال رسول الله (ﷺ): "ينزل عيسى ابن مريم فيقول أميرهم المهدي: تعال صل بنا فيقول: لا إن بعضهم أمير بعض تكرمة الله لهذه الأمة"[١].

لەجابری کوڕی عبداللهوە رسول الله فەرموویەتی: عیسای کوڕی مەریم دادەزێت و پێشەواکەیان مەهدی دەڵێت: وەرە و پێش نوێژمان بۆ بکە. ئەویش دەڵێت: نەخێر، هەندێکیتان بەسەر هەندێکیتان پێشەوان. ئەمە رێزێکە لەم گەلە نراوە.

(١) وهذا الحديث قال فيه ابن القيم في المنار المنيف إسناده جيد.

## کۆمەڵێک فەرموودەی صەحیح و حەسەن لەسەر مەهدی.

کەوا پلەی صەحیح و حەسەنیان هەیە، کەوا هاتوون لە سنن و مسندەکانی وەک ئیمامی ئەحمەد و ئەبو داود و ترمزی و إبن ماجە و چەندان پێشەوای تر...

١. عن أبي سعيد الخدري، قال: قال رسول الله (ﷺ): "المهدي مني، أجلى الجبهة، أقنى الأنف، يملأ الأرض قسطا وعدلا، كما ملئت جورا وظلما، يملك سبع سينين"[(١)]...

واتە مەهدی لەمنە، مەبەست لەنەوەکانی کەوا بە سەنەد هاتووە لە عترەتی فاتیمەیە علیه سلام و، لەنەوەکانی حسن و حسێنە. زەوی پڕ دەکات لە چاکە و دادگەری، وەک چۆن پڕ بوو بوو لەستەم و چەوسانەوە. حەوت ساڵیش دەمێنێت و حوکم دەکات.

٢. الْمَهْدِيُّ مِنَّا أَهْلُ الْبَيْتِ يُصْلِحُهُ اللهُ فِي لَيْلَةَ[(٢)].

(١) إسناده حسن، رواه أبی داود.

(٢) المسند (٢/ ٥٨) بسند صحيح عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُحَمَّدِ ابْنِ الْحَنَفِيةِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَلَيٍ (رضي الله عنهم) السلسلة الصحيحة.

واتە مەهدی لە ئال و بەیتی منە. خوای گەورە پلە و شکۆی لەیەک شەودا بەرزدەکاتەوە. واتای ئەوە دەگەیەنێت کە سەرەتا خۆی خۆی ناناسێت کە مەهدییە.

دواتر لەبەشێکی تایبەت بإذن الله زۆر بەووردی باسی ئەم وشە دەکەم.

٣. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): "أُبَشِّرُكُمْ بِالْمَهْدِيِّ يُبْعَثُ فِي أُمَّتِي عَلَى اخْتِلَافٍ مِنَ النَّاسِ وَزَلَازِلَ، فَيَمْلَأُ الْأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلًا، كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا، يَرْضَى عَنْهُ سَاكِنُ السَّمَاءِ وَسَاكِنُ الْأَرْضِ، يَقْسِمُ الْمَالَ صِحَاحًا فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: مَا صِحَاحًا؟ قَالَ: بِالسَّوِيَّةِ بَيْنَ النَّاسِ. قَالَ: وَيَمْلَأُ الله قُلُوبَ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ (ﷺ) غِنًى، وَيَسَعُهُمْ عَدْلُهُ، حَتَّى يَأْمُرَ مُنَادِيًا فَيُنَادِي، فَيَقُولُ: مَنْ لَهُ فِي مَالٍ حَاجَةٌ، فَمَا يَقُومُ مِنَ النَّاسِ إِلَّا رَجُلٌ، فَيَقُولُ: أنا. فيقول: ائْتِ السَّدَّانَ، يَعْنِي الْخَازِنَ، فَقُلْ لَهُ: إِنَّ الْمَهْدِيَّ يَأْمُرُكَ أَنْ تُعْطِيَنِي مَالًا، فَيَقُولُ لَهُ: احْثِ حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ فِي حِجْرِهِ وَأَبْرَزَهُ نَدِمَ، فَيَقُولُ: كُنْتُ أَجْشَعَ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ نَفْسًا، أَوَعَجَزَ عَنِّي مَا وَسِعَهُمْ؟ قَالَ: فَيَرُدُّهُ، فَلَا يَقْبَلُ مِنْهُ، فَيُقَالُ لَهُ: إِنَّا لَا

نَأْخُذُ شَيْئًا أَعْطَيْنَاهُ، فَيَكُونُ كَذَلِكَ سَبْعَ سِنِينَ أَوْ ثَمَانِ سِنِينَ أَوْ تِسْعَ سِنِينَ، ثُمَّ لاَ خَيْرَ فِي الْعَيْشِ بَعْدَهُ، أَوْ قَالَ: ثُمَّ لاَ خَيْرَ فِي الْحَيَاةِ بَعْدَهُ"(١).

واتە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: مژدەتان دەدەمێ بە مەهدی لەناو ئوممەتەکەمدا دێت و، لەکاتی ناکۆکی نێوان خەڵکی و بومەلەرزەدا دێت. زەوی پڕ دەکات لە ڕاستی و دادپەروەری، هەروەک چۆن پڕبوو بوو لە زوڵم و ستەم. لێی ڕازی دەبن دانیشتوانی ئاسمان و دانیشتوانی زەوی. پارە و سامان بەڕێکی دابەش دەکات. پیاوێك وتی: ڕێکی چۆنە؟ فەرمووی: بە یەکسانی لەنێوان خەڵکیدا. ئنجا فەرمووی: خوای گەورە دڵی ئوممەتی محمد (ﷺ) پڕ دەکات لە دەوڵەمەندی و، دادپەروەریەکەشی هەموویان دەگرێتەوە. هەتا بانگ دەرێک بانگ دەکات "کێ پێویستی بە پارەو سامانە؟" هیچ کەسێک لە خەڵکی هەڵناستێت و ناچێت بەدەم ئەو بانگەوازەوە. جگە لە یەک پیاو نەبێت. دەڵێت: من. ئەویش پێی دەڵێت: بڕۆ بۆ لای

(١) حديث حسن، رواه أحمد في المسند ورجاله رجال صحيح.

خەزنەدار و پێی بڵێ، مەهدی فەرمانی پێ کردوویت پارەم بدەیتێ. ئەویش پێی دەڵێت: هەڵیبرێژە و، هەتا کاتێک دەیکاتە ناو کۆشیەوە. ئەویش پەشیمان دەبێتەوە و، دەڵێت: من پیسکەترین کەسی ئوممەتی محمد (ﷺ) بووم. ئنجا دەڵێت: دەیگێڕێتەوە. ئەوانیش لێی وەرناگرنەوە و پێی دەڵێن: ئێمە کە شتێکمان بەخشی وەری ناگرینەوە. بەوجۆرە لەناوتاندا دەمێنێت حەوت ساڵ یان هەشت ساڵ یان نۆ ساڵ. پاشان هیچ خێر و خۆشییەک نامێنێت لەدوای ئەو، یان وتی: هیچ خێرێک لە ژیاندا نابێت پاش ئەو.

٤. عن سعيد بن المسيب، عن أم سلمة، قالت: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: "المهدي من عترتي، من ولد فاطمة". قال عبد الله بن جعفر: وسمعت أبا المليح، «يثني على علي بن نفيل، ويذكر منه صلاحا»[1].

واتە مەهدی لەنەوەی کوڕەکانی فاتیمەیە (رضي الله عنها). لەنێو کوڕەکانیدا لە نەوەی ئیمامی "حسن"ە (رضي الله عنه). کەواتە لە ئالوبەیتە و قوڕەیشیشە.

---

(١) إسناده صحيح

٥. عن عبد الله، عن النبي (ﷺ) قال: "لو لم يبق من الدنيا إلا يوم". قال زائدة في حديثه: "لطول الله ذلك اليوم". ثم اتفقوا "حتى يبعث فيه رجلا مني" أو "من أهل بيتي". يواطئ اسمه اسمي، واسم أبيه اسم أبي. زاد في حديث فطر: يملأ الأرض قسطا، وعدلا كما ملئت ظلما وجورا.

واتە گەر دنيا تەنيا ڕۆژێکی مابێت، ئەوا الله ئەم ڕۆژە درێژ دەکاتەوە تاوەکو پياوێک دەردەچێت لە من، واتە نەوەکانی منە. ناوی وەکو ناوی منە و، ناوی باوکيشی وەکو ناوی باوکمە، واتە محمد عبدالله. زەوی پڕدەکات لە دادگەری، هەروەک چۆن پڕبوو بوو لە ستەم و نادادی.

٦. يَقْتَتِلُ عِنْدَ كَنزِكُمْ ثَلَاثَةٌ كُلُّهُمُ ابْنُ خَلِيفَةٍ ثُمَّ لَا يَصِيرُ إِلَى وَاحِدٍ مِنْهُمْ ثُمَّ تَطْلُعُ الرَّايَاتُ السُّودُ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ فَيَقْتُلُونَكُمْ قَتْلًا لَمْ يُقْتَلْهُ قَوْمٌ ثُمَّ ذَكَرَ شَيْئًا لَا أَحْفَظُهُ فَقَالَ فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَبَايِعُوهُ وَلَوْ حَبوًا عَلَى الثَّلْجِ فَإِنَّهُ خَلِيفَةُ اللهِ الْمَهْدِيُّ.

سنن ابن ماجة كتاب الفتن باب خروج المهدي (٢/ ١٣٦٧) ومستدرك الحاكم. (٤٦٤-٤٦٣/ ٤) وقال هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ووافقة الذهبي وقال ابن كثير هذا

اسناد قوي صحيح وقال الالباني (الحديث صحيح المعنى دون قوله). فان فيها خليفة الله المهدي.

واتە سێ کەس لای گەنجینەکەی ئێوە دەکەونە شەڕەوە هەرهەموویان لە کوڕانی خەلیفەن. پاشان ئەو گەنجینە نابێت بە موڵکی هیچ کامێک لەوانە. دواتر لەلای خۆرهەڵاتەوە ئاڵا ڕەشەکان دەردەکەون، جەنگێکتان لەگەڵدا دەکەن کە کەس جەنگی وای نەکردبێت. پاشان "سەوبان" ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) شتێکی ووت کە بەڕاستی لەبەرم نەکرد. فەرمووی: کاتێک بینیتان بچن بەیعەتی پێ بدەن هەرچەندە بە گاگۆڵکێش بڕۆن بەسەر بەفردا.

سەبارەت بەو ڕستەیە (كُلُّهُمُ ابْنُ خَلِيفَةِ) واتە سێ کەس، هەریەک لەوان خەڵکێکی زۆر شوێنیان کەوتوون. هەریەک لەو سێ کەسەش باوکیان مەلیکە. ئەوان وەک موڵکی باوکیان داوای موڵک دەکەن. سەبارەت بە گەنجینەی کەعبەش دەڵێن: بریتییە لە گەنجینە ئاڵتونێکی زۆر کە کەوتووتە ژێر کەعبەوە. هەندێکیش دەڵێن: مەبەستی موڵک یا حوکم یان خەلافەتە.

هەشە دەڵێت گەنجینەکەی فوراتە کە شاخە ئاڵتوونەکەی تیا دەردەکەوێت.

٧. پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: "يَخْرُجُ فِي آخِرِ أُمَّتِي الْمَهْدِيُّ يَسْقِيهِ الله الْغَيْثَ وَتُخْرِجُ الأَرْضُ نَبَاتَهَا وَيُعْطِي الْمَالَ صِحَاحًا وَتَكْثُرُ الْمَاشِيَةُ وَتَعْظُمُ الأُمَّةُ يَعِيشُ سَبْعًا أَوْ ثَمَانِيًا"[١].

واتە لە ئاخری ئومەتی من مەهدی دەردەکەوێت. خوای گەورە بارانی بەڕەحمەتی پێدەدات و، زەوی بەروبوومی خۆی دەردەکات. ماڵ و سامان بە یەکسانی دەدرێت بەخەڵک و مەڕوماڵات زۆر دەبن و ئەم ئوممەتە گەورە دەبێت و خۆیشی حەفت یان هەشت ساڵ دەژییەت.

٨. عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال ذكر إلى النبي (ﷺ) المهدي فقال: "إن قصر فسبع وإلا فثمان وإلا فتسع وليملأن الأرض عدلاً وقسطاً كما ملئت جوراً وظلما"[٢].

---

(١) رواه الحاكم بسند صحيح، صحيح عَنْ سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) السلسلة الصحيحة (٢/ ٣٣٦).

(٢) قال الهيثمي رواه البزار ورجاله ثقات وفي بعضهم بعض الضعف.

لە ئەبو هرێرەوە الله لێی ڕازی بێتن، دەڵێت: باسی مەهدی کرا لای پێغەمبەر. فەرمووی مانەوەی بەلایەنی کەمەوە حەوت ساڵە یان هەشت ساڵ یان نۆ ساڵە. زەوی پڕ دەکات لە چاکە و دادپەروەری، هەروەک چون پڕبوو بوو لەستەم و زۆرداری و چەوسانەوە.

٩. هەروەها ئیمامی ئەحمەد و ئەبو داود وترمزی هێناویانە، بەمشێوەیە: لاتذهب الدنیا حتی یملك العرب رجل من أهل بیتي یواطئ أسمه وأسمي.

واتە دونیا ناڕوات و تەواو نابێت هەتاوەکو لە عەرەب، پیاوێک لە نەوەو ئالوبەیتی من دەردەچێت. ناوی هاوشێوەی ناوی منە.

فەرموودەیەکی صەحیحە لە موتەئخرین. ئەلبانیش بە صەحیحی داناوە. هەروەها حافظ جلال الدین سیوطی لە (عرف الوردی في أخبار المهدی) هێناویەتی.

١٠.ئیمامی ئەبوداود لە سونەنەکەی کتێبێکی داناوە بەناوی "مەهدی". هەر لەسەرەتای باب، دوو فەرموودەی هێناوە بەمشێوە: عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ)

يَقُولُ: "لَا يَزَالُ هَذَا الدِّينُ قَائمًا حَتَّى يَكُونَ عَلَيْكُمُ اثْنَا عَشَرَ خَلِيفَةً، كُلُّهُمْ تَجْتَمِعُ عَلَيْهِ الْأُمَّةُ". فَسَمِعْتُ كَلَامًا مِنَ النَّبِيِّ (ﷺ) لَمْ أَفْهَمْهُ، قُلْتُ لِأَبِي: مَا يَقُولُ؟ قَالَ: "كُلُّهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ"[(١)].

لەجابری کوڕی سمرەوە الله لێی ڕازی بێتن، دەڵێت: گوێم لە رسول الله (ﷺ) بوو دەیفەرموو: بەردەوام ئەم دینە خۆڕاگر و قایم دەبێت، تاوەکو لەنێویاندا دوانزە خەلیفە دەردەچێت. هەموو ئوممەت لەدەوریان کۆدەبێتەوە. ئنجا گوێم لە وشەیەکی رسول الله بوو تێی نەگەیشتم. بەباوکم گوت چیدەڵێت. وتی، دەڵێت: هەمووی لە قورەیشن[(٢)].

ئەوەی گرنگە ئیمامی ئەبوداود ئەم فەرموودەیەی بەستووەتەوە بە مەهدییەوە. هەروەها لە (عون المعبود)یش دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کەوا کۆتا خەلیفە مەهدییە.

١١. ئیمامی ترمزی و ئیمامی إبن ماجە فەرموودەیەکیان هێناوە کەوا پلەی حەسەنە، بەمشێوەیە: عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، أَنَّ

---

(١) حكم الحديث: صحيح

(٢) ئەم فەرموودەیە هەریەک لە ئیمامی بوخاری و موسلیم هێناویان.

النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "يَكُونُ فِي أُمَّتِي الْمَهْدِيُّ، إِنْ قُصِرَ فَسَبْعٌ، وَإِلَّا فَتِسْعٌ، فَتَنْعَمُ فِيهِ أُمَّتِي نَعْمَةً لَمْ يَنْعَمُوا مِثْلَهَا قَطُّ، تُؤْتَى أُكُلَهَا، وَلَا تَدَّخِرُ مِنْهُمْ شَيْئًا، وَالْمَالُ يَوْمَئِذٍ كُدُوسٌ، فَيَقُومُ الرَّجُلُ فَيَقُولُ: يَا مَهْدِيُّ، أَعْطِنِي. فَيَقُولُ: خُذْ".

واتە رسول الله دەڵێت: لەنێو ئوممەتی من مەهدی هەیە. گەر کەم بمێنێتەوە حەوت ساڵە و، گەرنا نۆ ساڵە. ئوممەتەکەم لەسەردەمی ئەودا دەکەونە نێو نازونیعمەت و خۆشییەوە. هەرگیز بەمشێوە نەبووە و نەیان بینیووە بەمشێوەیە. خواردن و خۆراکیان دەبێت و ماڵ زۆردەبێت و پیاو هەڵدەستێت و، دەڵێت: ئەی مەهدی بمدەرێ. دەڵێت: فەرموو.

ئەم فەرموودەیە أبو نعیم الأصبهانی هێناویەتی. هەروەها سیوطیش لەعرف الوردی هێناویەتی. ترمزیش دەڵێت فەرمودەیەکی حەسەنە. هەروەها لە موتەئەخرینیش ئەلبانی بە صەحیحی داناوە.

١٢. هەروەها "أبو نعیم" هێناویەتی و ئیمامی حاکم هێناویەتی لە موستەدرەک.

له ئەبو سعیدی خدری یەوە (ﷺ) له پێغەمبەرەوە دەفەرمووێت: "یخرج المدى في أمتى يبعث الله للناس غياث تنعم الأمة. وتعيش الماشية، وتخرج الأرض نباتها ويعطى المال صحاحا"[١].

١٣. أبو نعيم هێناویەتی هەروەها لەعرف الورديش هاتووه.

عن جابر (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): "ينزل عيسى ابن مريم فيقول أميرهم المهدي: تعال صل بنا فيقول: لا إن بعضهم أمير بعض تكرمة الله لهذه الأمة"[٢].

لەجابری کوڕی عبداللهوە، رسول الله فەرموویەتی: عیسای کوڕی مەریم دادەبەزێت. پێشەواکەیان مەهدییه. دەڵێت: وەره و پێش نوێژمان بۆ بکه. ئەویش دەڵێت: نەخێر، هەندێکیتان بەسەر هەندێکیتانەوە پێشەوان. ئەمە رێزێکه لەم گەله نراوه.

إبن القيم له (منار منيف)دا دەڵێت: إسنادی تەواوه. هەروەها ئەلبانیش تەصحیحی کردووه.

(١) ئیمامی حاکم دەڵێت صەحیحه، ئەلبانیش دەڵێت إسنادی صحیحه.

(٢) وهذا الحديث قال فيه ابن القيم في المنار المنيف إسناده جيد.

## سیفەتەکانی مەهدی بەپێی فەرمووده صەحیحەکان

١- ئەو کەسەی دەردەچێت، نازناوی مەهدی یان مەشهور و ناسراوه به "المهدی". چۆن بڵێی کەسێکی هیدایەتدراو بۆ چاکه دادگەری. چونکه بەپێی دەیان فەرمووده و قەول نازناوی ئەو کەسه مەهدییه.

٢- ئەمیره یان خەلیفەیه، هەروەها کۆتا خەلیفەی ئیماندارانه، چونکه خەلافەتی ئیسلامی دەگەڕێنێتەوه لەڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوای زەوی. هەروەها ئامانجی (الخلافة علی منهاج النبوة)یه.

٣- مەهدی و خەلیفەی ئیمانداران عەرەبه، بەپێی دەقی نەقڵی. واته له قەومی عەرەبه، نه فارسه و نه عەجمه و نه کورده و نه تورکه.

٤- ناوی هاوشێوەی ناوی پێغەمبەره یان وەک ناوی ئەوه. هەروەها ناوی باوکیشی، واته زۆرینەی ڕاوبۆچوونی زانایان بۆ ئەوه دەچێت کەوا ناوی (محمد بێت و باوکیشی عبدالله بێت).

٥- قورەیشییە، واتە لە عەشیرەت و تیرەی قورەیشە، چونکە بەپێی فەرمووده، خەلیفە دەبێت قورەیشی بێت. هەروەها قورەیشیش لەعەرەبە.

٦- لە ئالوبەیتی پێغەمبەرە.

٧- لە عەترەتی فاطمەی کچی پێغەمبەرە (عَلَيْهِ السَّلَامُ).

٨- لەنەوەی حسن بن علی یە، الله لێیان ڕازی بێتن. هەروەک ئیمامی إبن القیم دەڵێت: چونکە ئیمامی حسن دەستبەرداری خەلافەت بوو. بەمەش فیتنەیەکی گەورەی کوژاندەوە. هەربۆیە الله لە نەوەکانی و پشتی خەلافەت دەژیەنێتەوە.

٩- زەوی پڕ دەکات لە چاکە و دادگەری.

١٠- کاتێک دەردەچێت زەوی پڕ بووە لەستەم و زۆرداری و چەوسانەوەی موسڵمانان.

١١- حەوت ساڵ، بەلایەنی زۆرەوە ئەوپەڕی تاوەکو نۆ ساڵە حوکم دەکات. بەڵام واگونجاوە کەوا حەوت ساڵ حوکم دەکات.

١٢- عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) نوێژی لەدواوە دەکات.

## ناوی بەشێک لەوانەی کراون بەمەهدی یان خۆیان بەمەهدی داناوە لەمێژوودا.

بێگومان باسی مەهدی هەر لەکۆنەوە تائێستاش بەهەند وەرگیراوە، بگرە جۆرێک لەخۆ پێ گەورەکردن و ناودەرکردنی پێ کراوە لەمێژوودا. زۆرن ئەوانەی کە کراون بەمەهدی یان خۆیان بەمەهدی داناوە، ئنجا هەریەکە و لەزەمەن و کاتێکی جیاوازە.

١. یەکەم کەس کەوا سیفەتی مەهدیان داوەتە پاڵ و کردویان بەمەهدی (ئەبو القاسم محمد بن علی بن أبی طالب الهاشمی)یە (رَحِمَهُ اللهُ) ناسراوە بە (إبن الحنفیه).

حافظ ذهبی لە سیر أعلام، لە بەرگی چوار لاپەڕە ١١١ دەڵێت: شیعەکانی ئەو کات غلویان لەخۆشویستنی کردووە و، بەئیمام و پێشەوایان داناوە و نازناوی مەهدیان پێ بەخشیووە و، تەنانەت وا بیریان دەکردەوە کەوا نامرێت!

هەروەها حافظ إبن حجر لە إصابة جزء ٦ لاپەڕە ٣٥١دا دەڵێت: یەکەم کار إبن زبیر، واتە "عبدالله بن زبیر بن العوام"، إبن الحنفیەی نارده کوفە، بۆ تەواوکردنی کاری بەیعەتی. ئنجا

عبدالله بن مطيع، والی كوفه بوو، وای بڵاوكردەوە كەوا إبن الزبير هاتووە بۆ خوێنی حسن. بۆيە وای بڵاوكردەوە كەوا محمد بن علی، مەهدی چاوەڕوانكراوی كۆتا زەمانە. بێگومان من ناچمە نێو وردەكارییەوە، بەڵام ئەمە لەسەردەمی هاوەڵان و إبن عباس دا بووە.

٢. دووەم كەس موسی بن طلحة بن عبيدالله بن تيمی القرشی.

أبو حاتم دەڵێت: چاكترين كوڕی طلحه موسی بوو دوای محمد، خەڵك پێيان وابوو كە مەهديە. كەوا ئەثەريش هەيە نعيم بن حماد لە فتن بەژمارە ٤٠٥ و، أبو نعيم لە حليە جزئی ٤ لاپەڕە ٣٧١ هێناويەتی.

٣. سێيەم كەس كەوا پێيان گوت مەهديە و، نازناوی مەهديان پێدا، أبی جعفر محمد بن الباقر ابن علی زين العابدين ابن الحسين ـە (رَحِمَهُ اللهُ). بەڵام ئەو ڕەتيدەكردەوە و دژی ئەمەش بوو زەهبی و مزی باسيدەكەن بەوەی كەوا "محمد بن الباقر" دەڵێت: خەڵك پێيان وايە من مەهديم، بەڵام واللە من هەو نيم.

فیرقەیەکی شیعە هەیە بەناوی (ناووسیە) پێیان وایە محمد الباقر مەهدیە و نەمردووە و نامرێت.

٤. هەندێکیش پێیان وابوو کەوا خەلیفە عمر بن عبدالعزیز (رَحِمَهُ الله) مەهدییە. حافظ ذهبی لە سیر طبقەی ٥ لاپەڕە ٣٣٣ هێناویەتی دەڵێت: "ابراهیم بن مسیره" بە طاووسی گوت، ئایا عمری کوڕی عبدالعزیز مەهدییە. ئەویش گوتی، بەڵێ مەهدیە، بەڵام عەدلی بەتەواوی جێبەجێ نەکردووە.

هەروەها پرسیار لە سعید بن المسیب (رَحِمَهُ الله) کرا، کێ مەهدییە؟ گوتی، چوویتە خانووی "مروان"؟ گوتی، نەخێر. گوتی، بڕۆ لەوێدا دەیدۆزیتەوە. کابرا چوو کەسێکی نەبینی، تا پێی بڵێن ئەوە مەهدییە. گەڕایەوە لای ئیمام و، پێی گوت کەسم نەبینی. سعید گوتی، ئایا "ئەشج"، عمری کوڕی عبدالعزیزت نەدیبوو، پاڵکەوت بوو، لەسەر جێگا. فەرمووی بەڵێ گووتی ئەوە مەهدیە.

٥. درۆزن و منافق صالح بن طریف. لەساڵی ١١٠ی کۆچی لەدایک بووە. لە وڵاتی مەغریب بانگەوازی پێغەمبەرایەتی کرد بەوەی کەوا بەزمانی گەلەکەی نێردراوە. دواتر بڵاوی

کردەوە کەوا ئەو مەهدی گەورەیە و، دەگەڕێتەوە لەگەڵ عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) و دەججال دەکوژن و زەوی پڕ دەکات لە چاکە و دادگەری.

٦. یەکێکی تر لەوانەی پێیان دەگوت مەهدی، محمد (النفس الزكية) بن عبدالله الكامل بن الحسن المثنى بن الحسن السبط الهاشمي القرشي یە. لەدایک بووە لە مەدینە لەساڵی ١٠٠ی کۆچیدا و، لەنەوەکانی ئیمامی علی یە و، ناسراوە بە "النفس الزكيه". زۆرێک لە خەڵک و تەنانەت بەشێک لەزانایانیش پێیان وابوو مەهدییە. تەنانەت فتوای ئەوە دەرکرا کەوا دەربچن لەگەڵی بۆ گێڕانەوەی خەلافەت و، لەلایەن جەیشی ابو جعفرەوە شەهید دەکرێت. دوای شەڕێکی زۆر سەخت و توند و سەریشی لێ دەکەنەوە. هەروەها هەریەک لە أبو حنیفە و مالك بن أنس لە پشتیوانانی ئەو بوون. بەهۆی لێکچوونی ناوی (إسمه كإسمي وإسم أبيه كإسم أبي).

هەروەک مێژوونوسانی ئیسلامی شاهێدی پاکی و زیرەکی و عیبادەت و تەقوای بۆ دەدەن. بەجۆرێک لە عیلم و زانست پێشەنگ و پێشەوا بووە. تابعیش بووە، بۆیە زۆرێک وایان گوومان بردووە، کەوا زۆرینەی سیفەتەکانی مەهدی

لێدەرکەوتووە. هەروەها خۆشی هەرگیز ئەم نازناوەی بەخۆی نەداوە، بەڵام بەشێک لەزانایان و خەڵک دایانناوە.

٧. یەکێکی تر لەو کەسانەی کەوا پێیان وابوو مەهدی بێت، ئیمام جعفر الصادق ابن محمد الباقره. هەروەک ابن تیمیه لە منهاج السنه ٣ / ٤٨٠ دا دەڵێت: بەشێک لەشیعەی ڕافیزە دەڵێن، جعفر نەمردووە و زیندوو دەبێتەوە، ئەو مەهدی چاوەڕوان کراوە.

٨. موسی بن جعفر الصادق، کەوا فیرقەیەک لە شیعە بەناوی "موسەوی". پێیان وایە مەهدی چاوەڕوان کراوە. هەروەها محمد بن جعفریشیان بە مەهدی دادەنا. ئەوەی گرنگە زۆرینەی ئالوبەیت کراون بەمەهدی، بۆیە ناکرێت دانە بەدانە هەر هەموویان بهێنم و باسییان بکەم.

٩. یەکێک لەوانەی درۆزن و منافق و چاو لە دەسەڵات، کەوا بانگەوازی ئەوەی دەکرد مەهدی بێت إبن تومرتە. ناوی محمد بن تومرت بن عبدالله بن یا مصال ابن تومرت. لەساڵی ٤٧١ی کۆچی لەدایک بووە.

ابن تیمیە لەمنهاج السنە بەرگی ٢ لاپەڕە ١٩٠ دا دەڵێت: ابو عبدالله محمد بن تومرت کە لەقەبی مەهدی لێنرابوو، لە مەغریب دەرکەوت. ئنجا کۆمەڵەیەک ناویان لەخۆ نابوو (الموحدین) بەوەی کەوا دەیان گوت: ابن تومرت مەهدی موژدە پێدراوە و، مەهدی (معصود الموعود)ە، ئەوەی کەوا زەوی پڕ دەکات لە چاکە و دادگەری.

هەروەها ابن القیم لە منار المنیف دا دەڵێت: سەبارەت بە محمد بن تومرت کەوا پێیان دەگوت مەهدی و، ناوی مەهدی پێدرابوو. ئەو درۆزنێک بوو ستەمکار و پاشایەکی چەوسێنەر و فاسید بوو.

١٠. یەکێکی تر لەو درۆزنانەی کەوا دەیگوت مەهدیم، أبو عبدالله حسین بن منصور الحلاج (٨٥٨ - ٢٦ مارس ، ٩٢٢) (٢٤٤ك - ٣٠٩ك) بوو کەوا صۆفی قەبر پەرست بوو. إبن تیمیە دەڵێت: کەسێکی کافر و مورتەدبو زەندیق بوو. بۆیە وای نابینم هیچ یەکێک لەزانایان بەچاکە باسی بکەن. هەروەها زۆرینەی زانایان زەمیان کردووە و بەکافر و مورتەدیان داناوە.

١١. ابن کثیر له البدایة والنهایه، له ڕووداوەکانی ساڵی ٧٢٩ هێناویەتی. له ڕۆژی جومعەی زی القعده، پاش نوێژی جومعه، یەکێک هەڵدەستێتە سەر مینبەر له مزگەوتی حاکم له میسر، له بنەماڵەی ممالیک، پێیان دەگوت (أوصی) بانگەوازی ئەوەی دەکرد کەوا مەهدی چاوەڕوانکراو بێت.

١٢. هەروەها کەسێکی تر بەناوی حسن بن عبدالله الأخلاطی الحسنی، ابن العماد لەشذرات الذهب له له ٦، لاپەڕە ٣٥٦ دا هێناویەتی، له ڕووداوی ساڵی ٧٩٩ی کۆچیدا. هەروەها کیمیازان بوو بەمەش ناسراو و ناوی دەرکردبوو. دەگەڕایەوە بۆ الرفض، چونکه نوێژی هەینیان نەدەکرد. شوێنکەوتوانی پێیان دەگوت مەهدی یه.

١٣. هەروەها شێخ جهیمان العتیبی زاواکەی محمد القحتانی لەخەودا ئاماژەی بەوە کرد کەوا مەهدییه. هەروەها ئەم ڕووداوە چل ساڵ پێش ئێستا بوو. ناسراوە بە ڕووداوی "جهیمان" و برهەی یەکەم کەوا لەفەرموودەش وارده.

لەکۆتاییدا زۆرێک هەبوون له مێژوودا لەنێو ئیسلام و موسڵمانان کەوا پێیان گوتراوە مەهدی، بەهۆی هەندێک نیشانه و سیفات. هەروەها شیعەی ڕافیزەش زۆرێکی بەمەهدی داناوه

و شوبهاندوه. بەڵام بە عەقیدەیەکی پووچ و پۆخڵەوات، بەشێکیان تائێستا چاوەڕێی مەهدی چاوەڕوانکراو، "حسن العسكري" دەکەن بەوەی لەنێو (سەردابی سامەڕا)دایە، زیندووە و لەوێوە دێتەدەرەوە. هەروەها لەنێو کوردیش ئەم شتە وجودی هەبووە. کەسی وا هەبووە کەوا بەدرۆ ناوی مەهدیان داوەتەپاڵ خۆیان، بەڵام ئێمە وەک ئەهلی سوننە، پێمان وایە مەهدی چاوەڕوانکراو، ئەوەیە کەوا رسول الله خەبەری پێداوین، بەپێی ئەو سیفەتانەی کەوا لەسەری هاتوون. هەروەها دوای دەرچوونی نیشانە بچووکەکان و، شوێن و کاتی هاتنی بەستراوەتەوە بەو ڕووداو و پێشهاتانەی کەوا لەفەرموودەکان بۆمان ڕوونکراونەتەوە.

فەرموودەی (لا مهدي إلا عيسى) زۆرێک هەن احتجاج بەو فەرموودەیە دەکەن، ڕەفزی ئەو فەرموودانە دەکەن کەوا هاتوون لەسەر پێشەوا مەهدی و، دەڵێن شتێک نییە بەناوی مەهدی، ئەوەی هەبێت عیسایە (عَلَيْهِ السَّلَامُ) کە دادەبەزێت.

ئەم فەرموودەیە ئیمامی إبن ماجە لە سونەنەکەی بەژمارە (٤٠٣٩) هێناویەتی. بەڵام زانایان وەڵامیان داوەتەوە بەمشێوەیە:

ئیمامی البیهقي بەلاوازی داناوە. هەروەها ئیمامی حاکم و شیخ الإسلام إبن تیمیة في منهاج السنة (٢٥٦/ ٨). هەروەها ابن القیم في المنار المنیف (ص ١٤٨).

حافظ الذهبي له "میزان الاعتدال" (٥٣٥/ ٣): هو خبر منکر اهـ. دەڵێت: ئەمە هەواڵێکی قبوڵنەکراوە.

هەروەها ملا القاري في "مرقاة المفاتیح" (١٨٣/ ١٠): ضعیف باتفاق المحدثین اهـ. دەڵێت: ئەم فەرموودەیە لاوازە بە کۆدەنگی موحەدیثان.

هەروەها الشوکاني له "الفوائد المجموعة" (١٢٧)دا دەڵێت: قال الصغاني: موضوع اهـ. صغانی دەڵێت: موضوع، فەرموودەی مەوضوع، واتە درۆ بەدەمی پێغەمبەر. بەهەموو شێوەیەک ڕەفزە.

هەروەها الألباني هێناویەتی له "سلسلة الأحادیث الضعیفة" (٧٧)دا، دەڵێت: منکر.

ئەم فەرموودەیە له سەنەدی محمد بن خالد کەوا مەجهوله لای زانایان. هەروەها أبان بن أبي عیاش کەوا کەسێکی (متروك) له (حسن عن النبي (ﷺ))، کەوا (منقطع)ە.

هەروەها ئیمامی بیهقی دەڵێت: تفرد به محمد بن خالد هذا وقد قال الحاكم أبو عبدالله هو مجهول وقد اختلف عليه في إسناده فروي عنه عن أبان ابن أبي عياش عن الحسن مرسلا عن النبي، قال فرجع الحديث.إلى رواية محمد بن خالد وهو مجهول عن أبان بن أبي عياش وهو متروك عن الحسن عن النبي وهو منقطع، والأحاديث على خروج المهدي أصح إسنادا. انتهى.

هەروەک لەسەرەوە ئاماژەم پێدا کەوا "بیهقی" بەلاوازی داناوە کەوا ئیمامی حاکم نقد لەسەنەدی فەرموودەکە دەگرێت بەوەی مەجهول و مەتروکی تێدایە و، ئەثەریکی منقطع یشه. واتە لەچەندان لاوە ئەم فەرموودەیە لاوازە، مەجهول و مەتروک و پچڕانی تێدایە، ئەمە ئەوپەڕی پلەی لاوازییە. وەک گوتمان بەشێک لەزانایان بەدرۆ و دروست کراویان داناوە ئەم فەرموودەیە.

بۆیە ئەم فەرموودەیە لاوازە و دوورە لەڕاستی. هەروەک زانایان لەسەلەف و خەلەف دانیان بە فەرموودەکانی مەهدی دا ناوە و، بەشێکی زۆریش ئیسپاتی تەواتری مەعنوی

فەرموودەکانی مەهدی دەکەن. بۆیە ناکرێت لەپێناو فەرموودەیەکی درۆ و لاواز، چەندان فەرموودەی صەحیح و حەسەن فڕێ بدرێت و بەلاوە بنرێت.

## سیفاتی خەلقی و خولقی مەهدی.

بێگومان بۆ ناسینی ئیمامی مەهدی پێویستە ئەم سیفەتانەشی بزانین، چونکە وەک لەباسێک ئاماژەم پێداوە، دەیەها کەس لەمێژوودا تائێستا بانگەوازی ئەوەیان کردووە کەوا مەهدین و سیفاتی مەهدیان داوەتەپاڵ خۆیان. لەباسێک پێش ئێستا باسی سیفەتی زەمەنی مەهدیم کرد کەوا چەند نیشانە و خاڵ و ڕووداوێک هەن تاوەکو بزانرێت کەوا زەمەنی مەهدییە. سیفەتی بەدیهێنراویی و سیفەتی ڕەوشتی. کۆمەڵێك فەرموودە لەم بارەوەیەوە:

١. عن عبد الله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): "لا تذهب الدنيا حتى يملك العرب رجلٌ من أهل بيتي، يواطئ اسمه اسمي".

لە عبداللەوە دەڵێت رسول الله (ﷺ) فەرمووی: دونیا ناڕوات و کۆتایی پێ نایەت، هەتا پیاوێک لە عەرەب دەرنەچێت کەوا لە ئالوبەیتی منە و ناوی خۆی و باوکی هاوشێوەی منە.

٢. وفي رواية: "لو لم يبق في الدنيا إلا يوم، لطول الله ذلك اليوم حتى يبعث فيه رجلاً من أهل بيتي، يواطئ اسمه اسمي، واسم أبيه اسم أبي، يملأ الأرض قسطاً وعدلاً، كما ملئت ظلماً وجوراً".

هەروەها لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە، گەربێت و دونیا یەک ڕۆژی مابێت الله ئەم ڕۆژە درێژدەکاتەوە، تاوەکو پیاوێک لە ئالوبەیتی من دەردەچێت. ناوی خۆی و باوکی هاوشێوەی هی منە. ئنجا زەوی پڕ دەکات لە چاکە و دادگەری وەک چۆن پڕ ستەم و زۆرداری بوو بوو.

ئەم فەرموودەیە کۆمەڵێک لەپێشەوا هێناویانە لەوانە الإمام أبو عيسى الترمزي، في جامعه، والإمام أبو داود، في سننه. والحافظ أبو بكر البيهقي. والشيخ أبو عمرو الداني.

٣. وعن عبد الله (ﷺ) قال رسول الله (ﷺ): "لا تذهب الدنيا حتى يملك رجل من أهل بيتي، يواطئ اسمه اسمي، يملأ الأرض عدلاً وقسطاً، كما ملئت جوراً وظلماً"[١].

ئەم فەرموودەیەش هەمان فەرموودەی سەرەوەی عبداللهی کوڕی مسعوودە. بەڵام لە سنن الترمزی دا دەڵێت هەتاوەکو لەنێو عەرەب پیاوێک دەرنەچێت.

٤. وعن أبي هريرة (ﷺ) أن رسول الله (ﷺ) قال: "لو لم يبق من الدنيا إلا يوم، لطول الله ذلك اليوم حتى يلي رجل من أهل بيتي، يواطئ اسمه اسمي"[٢].

لەئەبی هرێرەوە لە رسول اللهوە دەفەرموویت: گەر دونیا یەک ڕۆژی مابێت، ئەوە الله ئەم ڕۆژە درێژدەکات، تاوەکو پیاوێک بێت لە ئەهل و بەیتی من ناوی هاوشێوەی ناوی منە.

(١) أخرجه الحافظ أبو القاسم الطبراني، في معجمه الصغير، بەمشێوە. وأخرجه الإمام أبو عيسى الترمذي في جامعه، وقال حتى يملك العرب رجل، وقال حديث حسن صحيح. وأخرجه أبو داود، في سننه، كما أخرجه الترمذي.

(٢) أخرجه الحافظ أبو عيسى الترمذي، في جامعه.

٥. وعن عبد الله بن مسعود (ﷺ) قال، قال رسول الله (ﷺ):

"لا تقوم الساعة حتى يلي رجل من أهل بيتي، يواطئ اسمه اسمي"(١).

له ابن مسعود الله لێی ڕازی بێت لەرسول الله دەفەرمووێت:

قیامەت هەڵناستێت تاوەکو پیاوێک لە ئەهل و بەیتی من دەردەچێک ناوی هاوشێوەی ناوی منه.

٦. عن عبد الله بن عمر (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ):

"يخرج رجل من أهل بيتي، يواطئ اسمه اسمي، وخُلُقُهُ خُلَقي، يملأ الأرض قسطاً وعدلاً"(٢).

وأخرجه الإمام أبو عمرو المقري في سننه، وزاد في آخره:

"كما ملئت ظلماً وجوراً".

له عبد الله بن عمر (ﷺ) دەڵێت، رسول الله (ﷺ) فەرمووی:

پیاوێک دەردەچێت لە ئالوبەیتی من. ناوی هاوشێوەی ناوی منه. خوڕەوشتی وەک خوڕەوشتی منه. زەوی پڕ لە چاکە و دادگەری دەکات وەک چۆن پڕ لە ستەم بوو بوو.

(١) أخرجه الإمام أحمد بن حنبل، في مسنده.

(٢) أخرجه الحافظ أبو نعيم، في صفة المهدي هكذا.

٧. عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم):
"المهدي مني؛ أجلى الجبهة، أقنى الأنف يملأ الأرض قسطاً وعدلاً، كما ملئت ظلماً وجوراً، يملك سبع سنين"[(١)].

ئەبو سعيد دەڵێت، رسول الله فەرمووی: مەهدی لە منە. پرچی لەناوەڕاستی بەرەوسەر ڕووتە و، لووتی کەمێک قەوس و چەمینەوەی پێوە دیارە. زەوی پڕ لەچاکە و دادگەری دەکات وەک چۆن پڕ لە ستەم و زۆرداری بوو بوو حەوت ساڵ حوکم دەکات.

٨. وعن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) عن النبي (صلى الله عليه وسلم) أنه قال:
"المهدي منا أهل البيت، رجل من أمتي، أشم الأنف يملأ الأرض عدلاً كما ملئت جوراً".

کۆمەڵێک فەرمووودەی تر هەن لە سەر شێوە و ڕووخساری کەوا هەریەک لە حافظ "أبو عبد الله نعيم بن حماد" لە کتاب (الفتن) و "أبو نعيم" لە (صفة المهدى) و (مناقب المهدى)دا، هەروەها لە موسەنەدی ئیمامی ئەحمەددا و کۆمەڵێک شوێنی تر

(١) أخرجه الإمام أبو داود، في سننه.والحافظ أبو عبد الرحمن النسائي، في سننه. والحافظ أبو بكر البيهقي، في البعث والنشور.

هاتوون، بەڵام لاوازن. ئەوانیش بەمشێوەیە باس لەوە دەکاتن لەکاتی دەرچوونی گەنجی کاملە، ڕووی وەک کەوکەبی درەوشاوە وایە، خاڵ لەسەر ڕوومەتی هەیە، ڕەنگی ئیسرائیلییە. هتد...

واتە سیفاتی بەدیهێنراوی مەهدی وەک پێغەمبەر نییە، بەڵکو جیاوازە. بەڵام ئەخلاق و ئادابی وەک ئەوە سبحان الله یەکێک ڕەوشت و ئاکاری وەک ئەو بێت، دەبێت چی پێشەوایەک بێت.

سیفات و شێوەی ئیمام مەهدی وەک لە هەندێک فەرموودە و ئەثەردا هاتوون هەندێکیان لاواز و هەندێکیان صەحیحن.

- ئیمامی مەهدی پرچی پڕ نییە جۆرێکە لەڕووتانەوەی پرچ، بەڵام کەچەڵیش نییە.
- شێوەی لووتی وەک هاتووە لەفەرموودەی صەحیح، کەمێک قەوس بووەتەوە و ڕێک نییە. چەمینەوەیەک لە ناوەڕاستی لوتیدا هەیە. ئەگەر زۆر سەرنجی نەدەیت وا هەست دەکەیت لوتی ڕێکە و، سەری لوتی کۆیە و بۆ دەرەوە دەرچووە.
- هەروەها لە ئالوبەیتە، واتە نەوەکانی کچی پێغەمبەرە. ئیمامی حسن و حسێن الله لێیان ڕازی بێتن. ڕای ڕاجح وایە کە

لەنەوەکانی ئیمامی حسن ـە، واللە أعلم. واتە فاطمی الحسنی.

- هەروەها ئیمامی مەهدی قورەیشییە و عەرەبیشە، واتە لەفەرموودە هاتووە کەوا عەرەبە هیچ قەومێکی تر نییە. لەهەندێک ئەثەردا هاتووە ڕەنگی ئەسمەرێکی سووورباوە.

- ناوی خۆی و باوکی هاوشێوەیە لەگەڵ ناوی رسول اللە (ﷺ). واتە محمد بن عبداللە ئەمەش بیروڕای زۆرینەی زانایانە لەسەر ناوی ئیمامی مەهدی، گەرچی بەشێک لەئێستادا دەڵێن دەکرێت هەرناوێکی تری پێغەمبەری هەبێت، وەک ئەحمەد و مەحمود و حاشی و هتد... بەڵام وەک زانایان دانیان بەوەدا ناوە کەوا ناوی محمد بێت و ناوی باوکیشی عبداللە بێت، واللە أعلم.

کەواتە بۆ موسڵمان گرنگە ناسینی، تەنانەت شکڵ و شێوەشی، چونکە وەک گوتمان زۆرێک تا ئەمڕۆش هەر بانگەوازی ئەوەیان کردووە کەوا مەهدیم. لەهەمووی گرنگتر بەشێک لەخەڵک بڕوایان پێکردووە، بۆیە یەکێک لەسیفاتی ئەهلی ئیمان و عیلم هەر لە سەلەف تا خەلەف هەرگیز بەخۆی نەوتووە مەهدیم. بۆنمونە، ناوی کۆمەڵێک زانا و تابعی و

ئێمامی سەلەفم هێنا کەوا کراون بە مەهدی. ووریابن (کراون بە مەهدی) جیاوازە لەوەی بڵێت (من مەهدیم). سبحان الله زۆرینەی ڕافیزە هەمیشە خۆیان بە مەهدی شوبهاندووە و داناوە. بەڵام ئەهلی سوننە بەپێچەوانەوە، کاتێک یەکێک چەند سیفەتێکی تێدابوو بێت، سیفەتی مەهدیان داوەتەپاڵ. وەک عمری کوڕی عبدالعزیز و هەندێکی تر کەوا بەشێکیان بە ئیجتیهادی خۆیان بە مەهدیان داناوە، لەبەر عەدالەتەکەی. ئەوەی لەسەر ئیمانداره ناوی بزانێت، بزانێت عەرەبە و قورەیشیشە و لەئالوبەیتە و سەر و سیمای بەمشێوەیە پشتیوان بە الله لێی تێک ناچێت.

## ڕووداوەکانی ساتی دەرچوونی مەهدی.

پشتیوان بە الله هەندێک ڕووداوی گرنگ بەبیر ئیمانداران دەهێنمەوە کەوا پێویستە بزانرێت. چونکە ڕووداوەکان ساتی دەرچوونی ئەم ئیمامە بەڕێزە ئاشکرا دەکەن. ئەمانیش بەکورتی بریتین لە:

١. بەیعەتی نێوان ڕووکن و مقام.

ئەم بەیعەتە تایبەتە بەچینێکی تایبەتی پشتیوانانی مەهدی کەوا الله پێیان دەبەخشێت ئەم بەیعەتە. وەک لە فەرموودەدا هاتووە ژمارەیان هێندەی ژمارەی (بەدرە) واتە ٣١٣ کەس دەبن. ئەم کەسانە الله تعالی ئەو پلەیەیان پێدەبەخشێت کەوا ئەم ئەرکە پیرۆزە ئەنجام بدەن. بەیعەتی نێوان ڕووکن و مقام دوای بەیعەیی محمد القحتانی و تێپەڕبوونی برهەیە، واتە دوای ڕووداوەکەی "جهیمان"ـە. جیاوازی نێوان بەیعەتی "جهیمان" و بەیعەتی ئیمامی مەهدی ئەوەیە کەوا لە ڕووداوی "جهیمان العتیبی"دا چەکیان پێ بوو، بەڵام پشتیوانانی مەهدی بێ چەکن.

فعن أم سلمة (رضي الله عنها) قالت قال رسول الله (ﷺ): "يبايع لرجل من أمتي بين الركن والمقام كعدة أهل بدر فيأتيه عصب العراق وابدال الشام , فيأتيهم جيش من الشام , حتى إذا كانوا بالبيداء خسف بهم ثم يسير إليه رجل من قريش أخواله كلب فيهزمهم الله". قال الراوي وكان يقال أن الخائب يومئذ من خاب غنيمة كلب[1].

ئەم بەیعەتە کاتێک دەدرێت کەوا ئەم شتانە ڕووبدەن:

(١) رواه الحاكم وأبو داوود وابن حبان بسند صحيح.

١- شەڕ و کوشتاری کوڕە پاشاکان لە سعودیە لەسەر دەسەڵات دوای مردنی پاشایەک.

٢- لەدوای وەرزی حەج و لەو ساتە دایە، واتە حاجییەکی زۆر دەکوژرێن و خوێن زۆر دەڕژێت.

٣- موسڵمانان بەدوای سەرکردەیەک وێڵن و پاشاگەردانی فیتنەیەکی زۆرە.

کەواتە بەم بەیعەتە دەزانین ساتەکە ساتی دەرچوونی ئیمام مەهدیە، والله أعلم. الله بمانکات لەوانەی بیعەت دەدەن.

## ٢. ڕۆچوونی سووپایەک.

یەکێکی لەو ڕوودا و نیشانە گرنگانەی کە پێویستە بزانرێت، ئەویش ڕۆچوونی سوپایەکە لە ناوچەی (بیداء) واتە یەکێکە لەنیشانە گەورەکانی ناسینی (ساتی دەرچوونی مەهدی) کەوا لە فەرموودەی صەحیح هاتووە. وەک ئەم فەرموودەیەی صەحیحی موسلیم، کتێبی (فتن وأشراط ساعة). ئەو سوپایەی کە ڕۆدەچێت: عَنْ عُبَيْدِ الله ابْنِ الْقِبْطِيَّةِ قَالَ: دَخَلَ الْحَارِثُ بْنُ أَبِي رَبِيعَةَ وَعَبْدُ الله بْنُ صَفْوَانَ وَأَنَا مَعَهُمَا عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رضي الله عنها) فَسَأَلَاهَا عَنِ الْجَيْشِ الَّذِي يُخْسَفُ بِهِ؟ وَكَانَ ذَلِكَ فِي أَيَّامِ

ابْنِ الزُّبَيْرِ، فَقَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): "يَعُوذُ عَائِذٌ بِالْبَيْتِ فَيُبْعَثُ إِلَيْهِ بَعْثٌ، فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الْأَرْضِ خُسِفَ بِهِمْ". فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَكَيْفَ بِمَنْ كَانَ كَارِهًا؟ قَالَ: "يُخْسَفُ بِهِ مَعَهُمْ، وَلَكِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى نِيَّتِهِ". وَقَالَ أَبُو جَعْفَرٍ: هِيَ بَيْدَاءُ الْمَدِينَةِ.

لە "عبيد الله"ی کوڕی "القبطية"ەوە دەڵێت: من و "حارث"ی کوڕی "أبو ربيعة"ــە و "عبيد الله"ی کوڕی "صفوان" چووین بۆ سەردانی "أم سلمة"ی دایکی بڕواداران (خوای لێ ڕازی بێت). هەردووکیان لێیان پرسی دەربارەی ئەو سوپایەی کە ڕۆدەچێت بە زەویدا. ئەوەش لەسەردەمی "إبن زبير"دا بوو. ئەوەیش وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: پەناهەندەیەک پەنادەبات بۆ کەعبە. سوپایەکی بۆ ڕەوانە دەکرێت، کاتێک دەگەنە دەشت و خاکێکی بەرفراوان ڕۆدەچن. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی ئەوەی بەزۆر بردوویانە چی بەسەر دێت؟ فەرمووی: ئەویش لەگەڵیان ڕۆدەچێت، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر نیاز و نیەتی خۆی زیندوو دەبێتەوە. "أبو جعفر" دەڵێت: ئەو دەشتە دەشتی مەدینەیە.

هەروەها بەمشێوەیەش هاتووە: عن عائشة (﵂) قالت: قال رسول الله (ﷺ): "يغزو جيش الكعبة، فإذا كانوا ببيداء من الأرض يُخسف بأولهم، وآخرهم". قالت: قلت يا رسول الله، كيف يخسف بأولهم وآخرهم وفيهم أسواقهم ومن ليس منهم؟ قال: "يخسف بأولهم وآخرهم، ثم يبعثون على نياتهم"[(١)].

دایكمان عائیشە الله لێی ڕازی بێتن دەفەرموویێت، رسول الله (ﷺ) فەرمووی: سووپایەک جەنگی کەعبە دەکات و دێت بۆی. کاتێک دەگاتە ناوچەی (بەیدا) لەزەویدا سەرەتا و کۆتایەکەی ڕۆدەچن بە ناخی زەویدا دەفەرموویێت: منیش گوتم یا رسول الله چۆن سەرەتا و کۆتایی لەنیو و ڕۆدەچن. لەکاتێکدا کەسانێکی تێدایە لەوان نین و پەیوەندیان بەوانەوە نییە؟ دەفەرموویێت: سەرەتا و کۆتایی ڕۆدەچن. دواتر لەسەر نیەتیان زیندوو دەکرێنەوە.

فەرموودە لەسەر ڕۆچوونی سووپایەک لەساتی هاتنی مەهدی زۆرە، ئیمامی بوخاری هێناویەتی، ئیمامی موسلیم هێناویەتی لەچەندان صەحابییەوە و صەحابی وەک دایكانی

(١) متفق عليه، وهذا لفظ البخاري.

ئیمانداارانی، وەک عائیشە و أم سلمە و حفصة و، چەندانی تر.

بەجۆرێک ئەم نیشانە وا لێکدەدرێتەوە کەوا عامی خەڵک بە خوێندەوار و نەخوێندەوارەوە هەموویان شتەکەیان بۆ ڕووندەبێتەوە. چونکە ڕۆچوونی یەک سوپای گەورە و بەهێز کە زۆرێک لەڕیوایەتەکان پێی دەڵێن سوفیانی، واتە سوپایی سوفیانی کەم نییە بۆ ئەوکاتە. بێگومان لەهەموو جیهان دەنگدەداتەوە، دوای ڕۆچوونی سوپا خەڵک بەلێشاو ڕوو لە ئیمام مەهدی دەکەن لەتەواوی جیهاندا.

کەواتە مەرجەکانی ناسینی ئەم سوپا ڕۆچووە:

١- دوای عائذی یەکەم ڕوودەدات واتە دوای "جهیمان العتیبی" ئەم جارە جەیشی خەسف ڕوودەدات.

٢- سوپاکە زۆرێک دەڵێن لەشامەوە بەڕێ دەکەوێت. شامیش گەورەیە لە نەخشەی کۆن شام، ئەردەن و فەلەستین و سوریا و چەند وڵاتێکی تر دەگرێتەوە.

٣- لە زەوییەکی گەورە و پانوبەرین هەموویان ڕۆدەچن بەناخی زەویدا.

کەواتە بەڕۆچوونی ئەم سوپایە، ساتی دەرچوونی ئیمامی مەهدی سەدا سەد دیارە و یەکلایی دەبێتەوە.

## عیسا علیه سلام نوێژ لەدوای مەهدی دەکات.

چەند فەرموودەیەکمان هەیە کەوا ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلیم و چەندان پێشەوای تر باسیان کردووە، سەبارەت بەنوێژکردنی عیسا عَلَيْهِ السَّلَام لەدوای مەهدی یەوە ئەمانیش:

١. عن أبي هريرة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: قال رسول الله (ﷺ): " كيف أنتم إذا نزل ابن مريم فيكم، وإمامكم منكم"[(١)].

لە ئەبو هرێرەوە، لەرسول اللهوە: ئێوە چۆن دەبن کاتێک عیسای کوڕی مەریم دادەبەزێت، پێشەواکەش لەئێوەیە.

٢. وعن جابر بن عبدالله الأنصاري (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: "لا يزال طائفة من أمتي يقاتلون على الحق ظاهرين إلى يوم القيامة".

(١) أخرجه الإمامان، أبو عبدالله محمد بن إسماعيل البخاري وأبو الحسين مسلم بن الحجاج القشيري، في صحيحيهما.

قال: "فينزل عيسى ابن مريم، (ﷺ) أميرهم: تعال صل لنا، فيقول: لا، إن بعضكم على بعض أمراء تكرمة الله تعال لهذه الأمة"[١].

جابری كوڕی عبدالله ده‌ڵێت: گوێم له‌ پێغه‌مبه‌ر بوو ده‌یفه‌رموو: به‌رده‌وام كۆمه‌ڵێک له‌پێناو حه‌ق له‌ئوومه‌ته‌كه‌م ده‌جه‌نگن و له‌سه‌ر حه‌قن. فه‌رمووی: عیسای كوڕی مه‌ریه‌م داده‌به‌زێت ئه‌میره‌كه‌یان ده‌ڵێت وه‌ره‌ و نوێژمان بۆ بكه‌. ئه‌میش ده‌ڵێت نه‌خێر، ئێوه‌ هه‌ندێكتان به‌سه‌ر هه‌ندێكتان ئه‌میرن ئه‌مه‌ش ڕێزه‌ له‌لایه‌ن الله‌وه‌ بۆ ئێوه‌.

٣. وعن حذيفة بن اليمان (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): "يلتفت المهدي، وقد نزل عيسى ابن مريم كأنما يقطر من شعره الماء، فيقول المهدي: تقدم، وصل بالناس. فيقول عيسى ابن مريم: إنما أقيمت الصلاة لك. فيصلي عيسى

(١) أخرجه الإمام مسلم، في صحيحه.

خلف رجل من ولدي، فإذا صليت قام عيسى حتى جلس في المقام فيبايعه"، وذكر باقي الحديث[١].

حوزەیفەی کوڕی یەمان دەڵێت: رسول الله فەرمووی: مەهدی ئاوڕ دەداتەوە کەوا عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت. پرچی تەڕە و وەک بڵێی ئاوی لێ بتکێت مەهدی پێی دەڵێت: پێشکەوە و نوێژمان بکە. عیسای کوڕی مەریەم دەڵێت: بەڵکو من قامەتی نوێژت بۆ دەکەم. ئنجا عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) نوێژ لەدوای پیاوێک لەمنداڵەکانم دەکات. هتد...

٤. عن عبدالله بن عمرو، قال: المهدي الذي ينزل عليه عيسى ابن مريم، ويصلي خلفه عيسى[٢].

عبداللهی کوڕی عمر الله لەخۆی و باوکی ڕازی بێتن دەڵێت: واتە فەرمووی مەهدی ئەوەیە کەوا عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دادەبەزێت و نوێژی لەدوا دەکاتن.

---

(١) أخرجه الحافظ أبو نعيم، في مناقب المهدي. وأخرجه أبو القاسم الطبراني، في معجمه.

(٢) أخرجه الحافظ أبو عبدالله نعيم بن حماد، في كتاب الفتن.

٥. وعن جابر بن عبدالله (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): "لا تزال طائفة من أمتي تقاتل على الحق، حتى ينزل عيسى ابن مريم عند طلوع الفجر، ببيت المقدسي ينزل على المهدي، فيقال: تقدم يا نبي الله، فصل بنا. فيقول: هذه الأمة أمر بعضهم على بعض"[١].

جابری کوڕی عبدالله دەڵێت، رسول الله فەرمووی: بەردەوام کۆمەڵێک لەئوومەتەکەم دەجەنگن لەسەر حەق، تاوەکو عیسای کوڕی مەریم دادەبەزێت. لەکاتی هەڵهاتنی فەجردا، له بیت المقدس دادەبەزێتە لای مەهدی. مەهدی پێی دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا وەرە و نوێژمان بۆ بکە. ئەویش دەڵێت: ئەم ئوممەتە هەندێکیان بەسە هەندێکیان ئەمیر و پێشەوان.

٦. وعن هشام بن محمد، قال: المهدي من هذه الأمة، وهو الذي يؤم عيسى ابن مريم[٢].

(١) أخرجه الإمام أبو عمر وعثمان بن سعيد المقري، في سننه.

(٢) أخرجه الحافظ أبو عبدالله نعيم بن حماد، في كتاب الفتن.

واتە مەهدی لەم ئوممەتەیە کەوا عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) نوێژی لەدوادا دەکات.

وعن أبي أمامة الباهلي (رضي الله عنه) قال: خطبنا رسول الله (صلى الله عليه وسلم) وذكر الدجال، وقال فيه: "إن المدينة لتنفي خبثها، كما ينفي الكير خبث الحديد، ويدعى ذلك اليوم يوم الخلاص". قالت أم شرك: فأين العرب يا رسول الله يومئذ؟ قال: "هم يومئذ قليل، وجلهم ببيت المقدس، وإمامهم مهدي رجل صالح، فبينما إمامهم قد تقدم يصلي بهم الصبح، إذ نزل عيسى ابن مريم، حين كبر للصبح فرجع ذلك الإمام ينكص. ليتقدم عيسى يصلي بالناس، فيضع عيسى يده بين كتفيه فيقول: تقدم فصلها، فإنها لك أقيمت. فيصلي بهم إمامهم"[١].

لە ئەبو ئومامەی باهلی یەوە الله لێی ڕازی بێتن دەڵێت: پێغەمبەر وتاری بۆ داین، باسی دەججالی بۆ کردین. دواتر فەرمووی: مەدینە پیس فڕێ دەدات وەک چۆن لەکارگە ژەنگ لەئاسن پاک دەبێتەوە. أم شریک وتی: ئەی عەرەب

(١) أخرجه الحافظ أبو نعيم، في كتاب الحلية. وأخرجه الحافظ أبو عبد الله محمد بن يزيد بن ماجة؛ في سننه أتم من هذا.

لەکوێن ئەوکاتە؟ ئەویش فەرمووی: عەرەب ئەوکات زۆر کەمن. لە بیت المقدس دان و، پێشەواکەیان مەهدیە. پیاوێکی چاکە، کاتێک ئیمامەکەیان -واتە مەهدی- دەیەوێت پێش بکەوێت و نوێژی بەیانی بکات. لەوکاتەدا عیسای کوڕی مەریم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دادەبەزێت. ئنجا مەهدی پێی دەڵێت وەرە و نوێژمان بۆ بکە.

ئەمەش بەهەمان شێوەی فەرموودەکانی ترە. لەکۆی ئەم فەرموودانە ئەوەمان بۆ دەردەچێت کەوا مەهدی لە بیت المقدس، واتە قودس دایە چونکە دەججال گەمارۆی داون. هەروەها کاتەکەش کاتی نوێژە و، نوێژەکەش نوێژی بەیانییە، واللە اعلم.

هەروەها عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) نوێژی لەدواوە دەکات. ئەمەش وەک ڕێزە بۆ مەهدی و ئەم ئوممەتە. ئنجا ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کەوا مەهدی لە عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) چاکەتر و پلەی بەرزتربێت. نەخێر، هیچ مرۆڤی وەک پێغەمبەران پلەیان بەرز نییە. جگەلەوەی عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دوای ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) گەورەترین موعجیزەی اللەیە. هەروەها لە أولو العزم ـە، بەڵام ئەمە وەک ڕێزێکە.

## ژیان لەسەردەمی "مەهدی"دا.

پووختەیەک لەوە باسدەکەم و دەخەمەڕوو کەوا لەکاتی هاتنی ئەم ئیمامە ژیان چۆن دەبێت. بێگومان وەک باسم کرد لەباسەکانی پێشووتردا کەوا ئیمامی مەهدی کاتێک دەردەچێت فیتنەیەکی گەلێک زۆر هەیە. هەروەها ناکۆکی لەنێوان خەڵک بەگشتی گەلێک زۆرە ستەم و زۆرداریش بەرامبەر بە موسڵمان لە لووتکەدایە. بۆیە رسول الله (ﷺ) دەفەرمووێت: (أبشركم بالمهدی). واتە موژدەتان پێ دەدەم بە مەهدی.

بۆیە گەر یەکێک رسول الله پێمان بڵێت موژدەتان پێ دەدەم بەهاتنی، بێگومان ئەمە هەر بۆخۆی گەورەترین خۆشییە بۆ موسڵمانان.

واتە هاتنی ئیمامی مەهدی موژدەی موسڵمانانە. هەروەها لە هەندێک ریوایەتدا دەفەرمووێت: "لولم یبق إلا الدهر یان لاتذهب الدنیا حتی یبعث رجل...".

ئەمەش گەورەیی و موژدەیەکی خۆشی ئەم ئیمامە دەردەخات بەوەی ئەگەر ژیان یەک ڕۆژی بمێنێت، ئەوە ئەوڕۆژە تەنها لەپێناوی ئەودا درێژ بکرێتەوە.

گەورەترین کاری ئیمامی مەهدی چییە؟ وەک لە زۆرینەی زۆری فەرموودە صەحیح و حەسەن و ضەعیفەکانیشدا هاتوون ئەوەیە کەوا (یملئ الأرض قسطا وعدلا...) واتە زەوی پڕ دەکات لە چاکە و دادپەروەری.

ئیمامێک و پێشەوایەک هەموو زەوی پڕ بکات لەچاکە و دادگەری، دەبێت چی خۆشییەک بێت. وەک لەفەرموودەکان سەرجەمی ڕیوایەتەکان وا هاتوون کەوا بە گشتی باسی زەوی دەکاتن، واتە ئیمامی مەهدی بەرەکەت و خۆشییە بۆ هەموو زەوی. هەموو زەوی پڕ لەخۆشی دەکات، نەک تەنها یەک شوێن. واتە ستەم چەوسانەوە ناهێڵێت و لەنێوی دەبات.

هەروەها ماڵ و سامان زۆر دەبەخشێت، وەک لەم فەرموودەیەدا هاتووە. وعن أم سلمة، زوج النبي (ﷺ) عن النبي (ﷺ) في قصة المهدي عليه السلام قال: "فيقسم المال، ويعمل في الناس بسنة نبيهم (ﷺ) ويلقي الإسلام بجرانه إلى الأرض، فيلبث سبع سنين، ثم يتوفى، ويصلي عليه المسلمون"[١].

---

(١) أخرجه الإمام أبو داود في سننه وفي رواية في تسع سنين. وأخرجه الإمام أبو عمرو الداني، في سننه.

له أم سلمەی دایکی ئیمانداران له پێغەمبەرەوە، لەباسی مەهدی دا دەفەرمووێت: ماڵ و سامان دابەش دەکات. هەروەها کار بە سوننەتی پێغەمبەر دەکات و، ئیسلام دەهێڵێتەوە لەسەر زەوی. ماوەی حەوت ساڵ حوکم دەکات.

کەواتە ماڵ و سامان دەبەخشێت و حوکم بە حوکمی الله دەکات و، هەر شوێنێکیش حوکمی اللهی لەسەر بێت، ئەوە ئەو شوێنە بەهەشتی زەوییە.

## مەهدی چەند ساڵ حوکم دەکات.

چەند فەرموودەیەک هەیە کەوا باس لەمانەوەی ئیمامی مەهدی دەکاتن، بەڵام جیاوازن بەجۆرێک لەهەندێکیاندا حەوت ساڵە و لەهەندێکی تریاندا هەشت و هەندێکی تریشدا نۆ ساڵە. فەرموودەکانم پێشووتر لەباسەکانی تر تەرجوومە کردووە، بۆیە من تەنیا ئاماژە بەساڵەکە دەکەم وەک:

١. وعن أبي سعيد الخدري (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): "يخرج رجل من أهل بيتي"، فذكر الحديث. وفي آخره: "ويعمل على هذه الأمة سبع سنين، وينزل بيت المقدس"[١].

فەرموودەی یەکەم لەئەبو سعیدەوەیە، ئنجا لەکۆتایەکەیدا دەڵێت حەوت ساڵ لەنێو ئەم ئوممەتە دەمێنێتەوە.

٢. وعن أبي سعيد الخدري (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): "لا تنقضي الساعة حتى يملك الأرض رجل من أهل بيتي، يملأ الأرض عدلاً، كما ملئت قبله جوراً، يملك سبع سنين"[٢].

فەرموودەی دووەم دیسان لەئەبو سعیدەوەیە، له رسول اللهوه، لەکۆتایەکەیدا دەڵێت: تاوەکو حەوت ساڵ حوکم دەکات.

---

(١) أخرجه الإمام أبو عمرو المقري، في سننه. وأخرجه الحافظ أبو نعيم الأصبهاني، في صفة المهدي.

(٢) أخرجه الحافظ أبو نعيم الأصفهاني في صفة المهدي.

٣. وعن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): "لا تقوم الساعة حتى يملك رجل من أهل بيتي، أقنى أجلى، يملأ الأرض عدلاً، كما ملئت قبله ظلماً، يكون سبع سنين".

فەرموودەی سێیەم، ئەمیش حەوت ساڵ حوکم دەکات.

٤. وعن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) قال: ذكر رسول الله (صلى الله عليه وسلم) بلاء يصيب هذه الأمة، ثم ذكر خروج المهدي (عليه السلام) وما يظهر الله تعالى على يديه من البركة، ثم قال: "يعيش في ذلك سبع سنين أو ثمان سنين"[١].

فەرموودەی چوارەم، لەکۆتایەکەیدا دەڵێت: بۆ ماوەی حەوت ساڵ دەژیەت یان هەشت ساڵ.

٥. وعن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) قال: خشينا أن يكون بعد نبينا حدث، فسألنا نبي الله (صلى الله عليه وسلم) فقال: "إن في أمتي المهدي، يخرج يعيش خمساً أو سبعاً أو تسعاً". قلنا: وما ذاك؟ قال: "سنين"[٢].

---

(١) أخرجه الحافظ أبو نعيم، في مناقب المهدي.ورواه الحافظ أبو القاسم الطبراني في معجمه.

(٢) أخرجه الإمام أبو عيسى الترمذي في جامعه، وقال: هذا حديث حسن.

فەرموودەی پێنجەم، دەڵێت: پێنج یان شەش یان حەوت.
گوتی ئەوە چییە؟ فەرمووی واتە ئەوەندە ساڵە دەمێنێتەوە.

٦. وعن أبي سعيد الخدري (ﭬ) قال: قال رسول (ﷺ): "أبشركم بالمهدي" فذكر الحديث. وفي آخره "فيمكث سبع سنين، أو ثمان سنين، أو تسع سنين". ثم قال: "لا خير في العيش بعده". أو قال: "لا خير في الحياة بعده"[١].

فەرموودەی شەشەم، دوای مژدە پێدانی مەهدی، لەکۆتایەکەیدا دەفەرمووێت: حەوت ساڵ حوکم دەکات یان هەشت ساڵ یان نۆ ساڵ.

٧. وعن عبدالله بن مسعود (ﭬ) قال: قال رسول الله (ﷺ): "لو لم يبق من الدنيا إلا ليلة، لطول الله تلك الليلة، حتى يملك رجل من أهل بيتي". وقال في آخر الحديث: "فيمكث سبعاً، أو تسعاً، ثم لا خير في عيش الحياة بعد المهدي"[٢].

---

(١) أخرجه الإمام أحمد بن حنبل، في مسنده.

(٢) أخرجه الحافظ أبو نعيم، في صفة المهدي.

فەرموودەی حەوتەم لە ابن مسعوودەوە الله لێی ڕازی بێت...
لەکۆتایەکەیدا دەفەرمووێت: حەوت ساڵ یان نۆ ساڵ حوکم دەکات.

٨. وعن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: "المهدي يعيش بعد ما يملك سبع سنين. أو ثمان، أو تسع"(١).

فەرموودەی هەشتەم، ئەمیش هەر دەڵێت: حەوت ساڵ یان هەشت یان نۆ ساڵ.

ژمارەیەکی زۆر لەفەرموودە مەوجودن بەلاواز و ڕاست و دروست لەکۆتاییدا چیمان بۆ دەردەچێت؟ واتە کۆکردنەوە لەنێوان ڕیوایەکاندا، ئەوەمان بۆ دەردەچێت کەوا ئیمامی مەهدی لەحەوت ساڵ کەمتر نییە، ماوەی حوکمڕانی. هەروەها لە نۆ ساڵیش زیاتر نییە، هەرچەندە زۆرینەی ڕیواتەکان دووپاتی حەوت ساڵ دەکەنەوە، بەڵام بەهۆی زۆری ڕیوایەت و ئیختلافی ساڵەکان لەو نێوە زیاتر تێپەڕناکات والله أعلم.

(١) أخرجه الحافظ أبو عبدالله نعيم بن حماد، في كتاب الفتن.

## ئایا ژیان دوای مەهدی هیچ خۆشیەکی هەیە؟

چەند فەرموودەیەک هەیە کەوا هاتووە لەسەر ئیمامی مەهدی، لەکۆتاییدا فەرموودەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەوا ژیان هیچ خۆشی نییە دوای نەمانی ئیمامی مەهدی. وەک ئەمانە:

١. عن أبي سعيد الخدري (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): "أبشركم بالمهدي" فذكر الحديث، وفي آخره "فيمكث سبع سنين، أو ثمان سنين، أو تسع سنين". ثم قال: "لا خير في العيش بعده". أو قال: "لا خير في الحياة بعده"[(١)].

له أبي سعيد الخدري یەوە (ﷺ) دەڵێت، رسول الله (ﷺ) فەرمووی: موژدەتان پێدەدەم بە هاتنی مەهدی. لەکۆتاییدا دەڵێت: حەوت ساڵ یان هەشت یان نۆ ساڵ دەمێنێتەوە دواتر فەرمووی، دوای ئەو ژیان هیچ خۆشی نییە یان خێر لەژیاندا نییە.

٢. عن عبدالله بن مسعود (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): "لو لم يبق من الدنيا إلا ليلة، لطول الله تلك الليلة، حتى يملك

(١) أخرجه الإمام أحمد بن حنبل، في مسنده.

رجل من أهل بيتي". وقال في آخر الحديث: "فيمكث سبعاً، أو تسعاً، ثم لا خير في عيش الحياة بعد المهدي"[١].

له عبدالله بن مسعود (ﷺ) دەڵێت، رسول الله (ﷺ) فەرمووی: گەر دونیا تەنها یەک شەوی مابێت، ئەوا الله ئەم شەوە درێژ دەکاتەوە تاوەکو پیاوێک لە ئەهل و بەیتی من حوکم دەکات حەوت یان نۆ ساڵ دەمێنێتەوە. ئنجا فەرمووی هیچ خێر و خۆشییەک نییە لەژیان دوای مەهدی.

وەک هاتووە بەوەی کەوا ئیمامی مەهدی حەوت ساڵ حوکم دەکات، هەروەها دەججال لەکۆتا حوکمی ئیمامی مەهدی دەردەچێت. واتە دوای ئەوەی قوستەنتینییە فەتح دەکەن، ئنجا دەججال دەردەچێت. دوای دەرچوونی دەججال، ئنجا لەکۆتا حوکمی دەججال عیسا (عليه السلام) دەردەچێت واتە عیسا (عليه السلام) لەکۆتا حوکمی مەهدی و دەججال دادەبەزێت.

بەڵام لەبارەی دابەزینی عیسا (عليه السلام) چەندین فەرموودەی صەحیحمان هەیە کەوا (متفق عليه)ین و لە سونەنەکانیش هاتوون بەمشێوەیە: أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ (ﷺ)

---

(١) أخرجه الحافظ أبو نعيم، في صفة المهدي.

قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): "وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَدْلًا، فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلَ الْخِنْزِيرَ، وَيَضَعَ الْجِزْيَةَ، وَيَفِيضَ الْمَالُ حَتَّى لَا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ، حَتَّى تَكُونَ السَّجْدَةُ الْوَاحِدَةُ خَيْرًا مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا". ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: {وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾}[١].

أبا هريره (رضي الله عنه) دەڵێت، رسول الله (ﷺ) فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، نزیکە لەوەی کەوا کوڕی مەریەم دابەزێتە نێوتان. کار بەدەستێکی دادپەروەرە و، خاچ دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت. جزیە هەڵدەگرێت و، ماڵ زۆردەبێت، تاوای لێدێت کەس نامێنێت کەوا وەری بگرێت. تاوەکو وای لێدێت، یەک سوجدەبردن لەو کاتەدا خێری زیاترە لە دونیا و لەوەی تێیدایە. ئنجا ئەبو هرێرە ئەم ئایەتەی خوێند: {وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾}.

ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلیم ڕیوایەتیان کردووە هەروەها بەچەندان شێوە و لەفزی جیاواز لە

---

(١) متفق عليه.

سونەن و موسەنەدەکانی تر هاتوون. ئەمانە دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کەوا ژیان لەسەردەمی عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەوپەڕی خۆشی و کامەرانی و دادگەریدایە. هەروەها عیسا دوای مەهدی حوکم دەکات و دەمێنێتەوە. ئەمەش واتای ژیان لەسەردەمی ابن مریم زۆر خۆشتر و دادگەر ترە. هەروەها ابن حجر العسقلانی لە فتح الباری لەبارەی عیسای ابن مریم ـەوە دەڵێت: وروى أحمد وأبو داود بإسناد صحيح من طريق عبد الرحمن بن آدم عن أبي هريرة مثله مرفوعا، وفي هذا الحديث: "ينزل عيسى عليه ثوبان ممصران فيدق الصليب ويقتل الخنزير، ويضع الجزية ويدعو الناس إلى الإسلام، ويهلك الله في زمانه الملل كلها إلا الإسلام، وتقع الأمنة في الأرض حتى ترتع الأسود مع الإبل وتلعب الصبيان بالحيات". وقال في آخره "ثم يتوفى ويصلي عليه المسلمون".

ئیمامی ئەحمد بە سەنەدی صەحیح هێناویەتی لە ئەبو هرێرەوە، عیسای کوڕی مەریم دادەبەزێت خاچ دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت و جزیە هەڵدەگرێت. هەروەها بانگی خەڵک دەکات تاوەکو بێنە نێو ئیسلامەوە. لەسەردەمی ئەودا هەموو ڕێبازێک لەنێو دەچێت جگە لەئیسلام نەبێت، تاوای لێدێت

ئەمانەت بەرپا دەبێت لەزەوی وشتر و شێر پێکەوەبن و منداڵ یاری بە مار بکات. ئنجا دەمرێت و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن.

ئەم فەرموودانە دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کەوا ژیان لەسەردەمی عیسادا (عَلَيْهِ السَّلَام) لەوپەڕی دادگەری و خۆشیدایە وەک دەزانرێت عیسا دوای مەهدی حوکم دەکات و دەمێنێتەوە بەمەش فەرموودەی هیچ خێرێک لەژیان دوای مەهدی نییە، دژ (تعارض)ـە لەگەڵ فەرموودەی صەحیح، بۆیە خێر لەسەردەمی عیسا (عَلَيْهِ السَّلَام) هەر دەمێنێت، والله اعلم.

## جەنگ و سەرکەوتنەکانی ئیمامی مەهدی.

دەمەوێت بەکورتی هەندێک جەنگ باس بکەم کەوا لەدوای دەرچوونی ئیمامی مەهدی ڕوودەدەن، چونکە کاتێک ئیمام دێت زەوی پڕ بووە لە کوفر و شیرک و ستەم و چەوسانەوەی موسڵمانان. بۆیە کاتێک کەسێک بێت و بیەوێت دادگەری بەرپا بکاتن، بێگومان هەموو کوفر یەک دەنگ و یەک ڕەنگ دەبن دژی و هەوڵی ڕێگری و لەنێوبردنی دەدەن. چونکە مێژوو بۆ

ئەمە شاهێدە و هەروەها واقعیش شاهێدە. لەدوای هاتنی مەهدی هەندێک جەنگ ڕوودەدەن، ئەوانیش بریتین لەمانەی خوارە:

### ١. فەتحی کەعبە - ڕزگارکردنی کەعبە.

هەر دوای ئەوەی کەوا عائذی دووەم و پشتیوانەکانی پەنایان بردە بەر کەعبە، چونکە رسول الله (ﷺ) دەفەرموویێت: (یعوذ عائذ بالبیت) واتە پەنا بگرێت، پەنا دەبەنەبەر کەعبە. وەک باسم کرد پەناگری دووەم ئیمامی مەهدی و پشتیوانەکانیەتی، بێ چەکن. لەم کاتەدا دوای بڵاو بوونەوەی دەنگۆی ئەم شتە، هەروەک لە چەندان فەرمووده و ئەثەردا لە کتاب الفتن نعیم بن حماددا هاتووە کەوا (نادی منادی ألا إن أمیرکم فلان یان نادی ألا فلان أمیرکم).

واتە جاڕدەرێک جاڕ دەدات بە گوێی گشت خەڵک و، پێیان دەڵێت ئەوە پێشەواکەتانە فڵان کەسە، واتە بۆنمونە دەڵێت ئەی خەڵکە ئەمە محمد بن عبداللهیە و ئیمامی مەهدییە.

هەروەها لە هەندێک ڕیوایەتدا هاتووە دەڵێت: (نادی منادی من السماء). جاڕدەرێک لەئاسمانەوە بانگی خەڵک دەکات،

ئەمەش ئەوەمان پێدەڵێت کەوا ئیمامی مەهدی و پشتیوانەکانی کەعبەیان فەتح کردووە و خەڵک بەیعەتیان پێداوە، چونکە ئەمە تەعبیرە لەوەی جاڕدەرەکە لەکەناڵە ئاسمانییەکان، بۆ نمونە لە کەناڵی فەرمی سعودیادا دەڵێت ئەمە فڵان کەسە و ئەمیری ئێوەیە. بەمەش خەڵک دەزانن کەوا چی ڕوویداوە، ئنجا لەوکاتەدا سووپایەک بەرەو ڕووی بەڕێ دەخرێت، بۆ لەنێوبردنی مەهدی. سووپایەکی گەورە بەرەو کەعبە بەڕێ دەکەوێت، زۆرێک لە ڕیواتەکان دەڵێن لەشامەوەیە و سووپای سوفیانییە. ئنجا ئەم سوپایە الله دەیانبات بەناخی زەوی و هەمووی لەنێو دەبات.

بەمەش شتەکە بەهەموو جیهاندا دەتەقێتەوە و سوپا ڕۆچووە. ئنجا خەڵک لەهەموو لایەکەوە بە پیاو و ژن ڕووی تێ دەکەن تاکو بەیعەتی پێ بدەن. بێگومان الله دەیسازێنێت لەشەوێکدا بۆ ئەم ئەرکە مەزنە، هەر زوو کوێ فەتح دەکات؟ جزیرەی عەرەب. بەڵام بەر لەوە، لەدوای ڕۆچوون (خسف) چەند چینێک تایبەت بەرەو ڕووی دەچن کەوا لە فەرموودە رسول الله دەڵێت: (عصائب أهل العراق و أبدال الشام و نجائب أهل الميصر ).

ئەم سێ چینە پێش عەوامی خەڵک بەرەو ڕووی دەچن تاوەکو پشتیوانی بن و سەری بخەن. وەک دەڵێن کەتیبەکانی عێراق، واتە مجاهید و سەرباز ئەمانەش دەبن بەپاڵپشت و سەرباز بۆ ئیمامی مەهدی. واتە لەشام و عێراق مجاهیدەکان بەرەو پیری دەچن تاوەکو پشتی بگرن، بۆیە دەتوانین بڵێین ئەمانە سوپایی ئیمامی مەهدین کەوا مجاهید و مهاجیرن. دوای چوونی ئەمانە، ئنجا خەڵکی بەگشتی ڕووی تێدەکەن، رسول الله لەفەرموودە پێمان دەفەرمووێت.

## ٢. فەتحی جەزیرەی عەرەب یان ڕزگارکردنی.

(تغزون جزيرة العرب فيفتحها الله ثم تغزون فارس فيفتحها الله ثم تغزون روم فيفتحها الله ثم تغزون دجال ، یان لەجێگای روم دجال). فەرموودەکە بەمشێوەیەیە، ئیمامی موسلیم هێناویەتی : عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، عَنْ نَافِعِ بْنِ عُتْبَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ) فِي غَزْوَةٍ، قَالَ: فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) قَوْمٌ مِنْ قِبَلِ الْمَغْرِبِ عَلَيْهِمْ ثِيَابُ الصُّوفِ، فَوَافَقُوهُ عِنْدَ أَكَمَةٍ، فَإِنَّهُمْ لَقِيَامٌ، وَرَسُولُ الله (ﷺ) قَاعِدٌ"، قَالَ: فَقَالَتْ لِي نَفْسِي: ائْتِهِمْ فَقُمْ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ لَا يَغْتَالُونَهُ، قَالَ: ثُمَّ قُلْتُ: لَعَلَّهُ نَجِيٌّ مَعَهُمْ، فَأَتَيْتُهُمْ فَقُمْتُ

بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ، قَالَ: فَحَفِظْتُ مِنْهُ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ أَعُدُّهُنَّ فِي يَدِي، قَالَ: "تَغْزُونَ جَزِيرَةَ الْعَرَبِ فَيَفْتَحُهَا اللهُ (عزة وجل)، ثُمَّ فَارِسَ فَيَفْتَحُهَا اللهُ (عزة وجل)، ثُمَّ تَغْزُونَ الرُّومَ فَيَفْتَحُهَا اللهُ (عزة وجل)، ثُمَّ تَغْزُونَ الدَّجَّالَ فَيَفْتَحُهُ اللهُ". قَالَ: فَقَالَ نَافِعٌ: يَا جَابِرُ، لَا نَرَى الدَّجَّالَ يَخْرُجُ حَتَّى تُفْتَحَ الرُّومُ.

لە "نافع"ی کوڕی "عقبە"ە، لە "جابر"ی کوڕی "سمره"ەوە، لە ئەویشەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: لە جەنگێکدا لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بووین. دەڵێت: لەوکاتەدا هۆزێک لە خۆرئاواوە هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەرگی خوریان لەبەردابوو. لای تەپۆڵکەیەکدا پێی گەیشتن، لەکاتێکدا ئەوان بەپێوەبوون. پێغەمبەری خوایش (ﷺ) دانیشتبوو. دەڵێت: نەفسم پێی دەوتم: بچۆ بۆلایان لەنێوانیاندا ڕاوەستە نەوەکو بەدزیەوە بیکوژن. دەڵێت: پاشان وتم: دەگونجێت نهێنییەکی لەگەڵیاندا هەبێت. منیش هاتم لەنێوان پێغەمبەر (ﷺ) و ئەواندا ڕاوەستام و، چوار وشەی لێوە فێربووم کە بەپەنجەی دەست دەیانژمێرم، فەرمووی: جەنگی دورگەی عەرەب دەکەن خوای گەورە ئازادی دەکات. پاشان جەنگی فارس دەکەن خوای باڵا دەست ئازادی دەکات. پاشان جەنگی ڕۆمەکانیش دەکەن

خوای گەورە ئازادی دەکات. پاشان جەنگی دەجاڵیش دەکەن خوای گەورە لەناوی دەبات. دەڵێت: "نافع" وتی: ئەی "جابر"، وانابینین دەججال دەربچێت تا ڕۆمەکان نەگیرێن.

بەپێی ئەم فەرمودەیە دوای فەتحی کەعبە ئنجا جەزیرەی عەرەبی، واتە نیشتیمانی عەرەب لەلایەن ئیمامی مەهدی فەتح دەکرێت.

### ٣. ڕزگاردنی فارس یان جەنگی فارس.

فارس، ئێران و وڵاتانی دەورووبەری، چونکە فارس هەر ئێران نییە. کەواتە جەنگەکانی سەردەمی ئیمامی مەهدی:

- جەزیرەی عەرەبی ڕزگار دەکەن واتە وڵاتە عەرەبییەکان.
- فارس، هەریەک لە ئێران و ئەفغانستان و پاکستان و وڵانی تری دەورروبەر.
- ڕۆم، ڕۆمیش ئەورروپا و ئەمەریکایە کەوا کۆتا خاڵی قوستەنتینیەیە واتە ئیستەنبوڵی ئێستا.
- شەڕی دەججال.

### ٤. فەتحی بيت المقدس، ڕزگار کردنی قودس.

لەسەرەتادا پایتەختی خەلافەتی مەهدی لە کەعبەیە، دواتر دوای فەتحی بیت المقدس، پایتەخی سەرەکی ئیمامی مەهدی و خیلافەت دەچێتە قودسەوە، چونکە لەفەرموودەکانی باس لەگەمارۆی دەججال بۆ مەهدی و پشتیوانەکانی دەکات. مەهدی و پشتیوانانی لە قودس گەمارۆ دەدرێن، هەروەها کۆتا خاڵیش بیت المقدس ـە بۆ دەججال. هەروەها لەفەرمووی دابەزینی عیسادا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لە (باب لد) و منارەی سپی دادەبەزێت هەر لەوێدا نوێژ دەکەن و، ئنجا دوای دەججال دەکەوێ و دەیکوژێت.

### ٥. جەنگی دابق (هرمجدون).

کۆتا خاڵ و جەنگ کەوا ئیمامی مەهدی دەیکات، پێش قوستەنتینییە پێی دەڵێن "الملحمة العظمى" یان "ملحمة الكبرى" یان "هرمجدون"، کەوا لەناوچەی (دابق) کە لە سووریایە، لەوێ جەنگەکە ڕوودەدات، لەبەرئەوەی لەفەرموودەدا دەڵێت: تغزون روم. دوای فارس ئەم جەنگەش دوای پەیمانێکە لەنێو ڕۆم و موسڵمانەکان، بەڵام پەیمان دەشکێت. ڕۆم لەژێر هەشتا ئاڵادا بۆ موسڵمانان دێن، هەر ئاڵایەک دوانزە هەزارە واتە نزیکەی

یەک ملیۆن. موسڵمانەکانیش بەهەمان شێوە لەناوچەی دابق، جەنگ ڕوودەدات بەجۆرێک سێیەکی سوپایی مەهدی ڕادەکەن لەڕێزی پێشەوە. الله هەرگیز تۆبەیان لێ قبوڵ ناکات. ئنجا بەشی دووەم دێن شەڕ دەکەن هەر هەموویان شەهید دەبن، ئەمانە باشترین شەهیدن لای الله. ئنجا بەشی سێیەم دێن سەرکەوتن بەدەست دێنن الله هەر گێز گومڕایان ناکات.

ئەم فەرموودەیە لە صحیح مسلم، کتاب فتن وأشراط ساعةدا هەیە بە درێژی، بەمشێوەیە: عَنْ يُسَيْرِ بْنِ جَابِرٍ قَالَ: هَاجَتْ رِيحٌ حَمْرَاءُ بِالْكُوفَةِ فَجَاءَ رَجُلٌ لَيْسَ لَهُ هِجِّيرَى إِلَّا: يَا عَبْدَالله بْنَ مَسْعُودٍ جَاءَتِ السَّاعَةُ. قَالَ: فَقَعَدَ وكَانَ مُتَّكِئًا فقَالَ: إِنَّ السَّاعَةَ لَا تَقُومُ حَتَّى لَا يُقْسَمَ مِيرَاثٌ، وَلَا يُفْرَحَ بِغَنِيمَةٍ. ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ هَكَذَا وَنَحَّاهَا نَحوَ الشَّأْمِ، فقَالَ: عَدُوٌّ يَجْمَعُونَ لِأَهْلِ الْإِسْلَامِ وَيَجْمَعُ لَهُمْ أَهْلُ الْإِسْلَامِ. قُلْتُ: الرُّومَ تَعْنِي؟ قَالَ: نَعَمْ، وَتَكُونُ عِنْدَ ذَاكُمُ الْقِتَالِ رَدَّةٌ شَدِيدَةٌ، فَيَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لَا تَرْجِعُ إِلَّا غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ، فَيَفِيءُ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، ثُمَّ يَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لَا تَرْجِعُ إِلَّا غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ، فَيَفِيءُ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى

الشُّرْطَةُ، ثُمَّ يَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لَا تَرْجِعُ إِلَّا غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يُمْسُوا، فَيَفِيءُ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ الرَّابِعِ نَهَدَ إِلَيْهِمْ بَقِيَّةُ أَهْلِ الْإِسْلَامِ، فَيَجْعَلُ اللهُ الدَّبْرَةَ عَلَيْهِمْ، فَيَقْتُلُونَ مَقْتَلَةً -إِمَّا قَالَ: لَا يُرَى مِثْلُهَا، وَإِمَّا قَالَ- لَمْ يُرَ مِثْلُهَا، حَتَّى إِنَّ الطَّائِرَ لَيَمُرُّ بِجَنَبَاتِهِمْ فَمَا يُخَلِّفُهُمْ حَتَّى يَخِرَّ مَيْتًا، فَيَتَعَادُّ بَنُو الْأَبِ كَانُوا مِائَةً، فَلَا يَجِدُونَهُ بَقِيَ مِنْهُمْ إِلَّا الرَّجُلُ الْوَاحِدُ، فَبِأَيِّ غَنِيمَةٍ يُفْرَحُ، أَوْ أَيُّ مِيرَاثٍ يُقَاسَمُ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ سَمِعُوا بِبَأْسٍ هُوَ أَكْبَرُ مِنْ ذَلِكَ، فَجَاءَهُمُ الصَّرِيخُ: إِنَّ الدَّجَّالَ قَدْ خَلَفَهُمْ فِي ذَرَارِيِّهِمْ، فَيَرْفُضُونَ مَا فِي أَيْدِيهِمْ وَيُقْبِلُونَ، فَيَبْعَثُونَ عَشَرَةَ فَوَارِسَ طَلِيعَةً. قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): "إِنِّي لَأَعْرِفُ أَسْمَاءَهُمْ وَأَسْمَاءَ آبَائِهِمْ وَأَلْوَانَ خُيُولِهِمْ، هُمْ خَيْرُ فَوَارِسَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ يَوْمَئِذٍ. أَوْ: مِنْ خَيْرِ فَوَارِسَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ يَوْمَئِذٍ".

"يُسير"ی کوڕی "جابر" دەڵێت: بایەکی تۆزاوی هەڵی کرد لە (کوفە). لەو کاتەدا پیاوێک هات هیچی پێنەکرا مەگەر ئەوە نەبێت کە دەیووت: ئەی "عبدالله"ی کوڕی "مسعود" وا قیامەت هات. دەڵێت: ئەویش کە پاڵیدابوویەوە، ڕاست بوویەوە و دانیشت و، وتی: قیامەت هەڵناسێت تاوەکو وای لێدێت

نە میرات دابەش دەکرێت و نە دڵ بە دەستکەوتی جەنگ خۆش دەکرێت. پاشان بە دەستی ئاماژەی کرد ڕووەو شام و وتی: دوژمنانێک خۆیان کۆدەکەنەوە بۆ ئیسلامخوازان و ئیسلامخوازانیش خۆیان کۆدەکەنەوە بۆ ئەوان. وتم: مەبەستت لە ڕۆمەکانە؟ وتی: بەڵێ، ئیتر لەوکاتەدا جەنگ بەرپادەبێت و بگرە و بەردەیەکی سەختی تێدا دەبێت کە موسڵمانان پەیمانی مەرگی تێدا دەدەن کە تا سەرنەکەون نەگەڕێنەوە. ئنجا کوشتار دەست پێدەکەن تاوەکو شەو دادێت و، دەبێت بە بەربەست لە نێوان ئەمان و ئەواندا. ئیتر هەردوولا، ئەمانیش و ئەوانیش دەگەڕێنەوە و هیچیان نابەزن و مەرجەکەش نایاتەدی. پاشان موسڵمانانان مەرجێکی دیکە دەدەن یا دەبێت بمرن، یا بەسەرکەوتوویی بگەڕێنەوە. دیسان دەکەونەوە کوشتارکردن تاوەکو شەویان بەسەردا دێت و، دەبێت بە بەربەست لە نێوانیاندا. ئیتر هەردوولا دەگەڕێنەوە ئەمانیش و ئەوانیش، بێ ئەوەی هیچیان ببەزن و مەرجەکەیش نایاتەدی. پاشان موسڵمانان مەرجێکی دیکە دەدەن کە یا دەبێت بمرن، یا بەسەرکەوتووی بگەڕێنەوە. هەمدیسان دەکەونەوە کوشتارکردن تاوەکو ئێوارەیان بەسەردا دێت. ئیتر هەردوولا ئەمانیش و

ئەوانیش دەگەڕێنەوە بێ ئەوەی هیچیان ببەزن و، مەرجەکەیش نایەتەدی. پاشان بۆ ڕۆژی چوارەم چی ماوە لە پاشماوەی ئیسلامخوازان بەرەو ڕوویان دەردەپەڕن، تاوەکو خوا تێکیان دەشکێنێت. جەنگێکی خوێناوی سەخت دەکەن کە کەس تا ئێستا شتی وای نەدیبێت، بەڕادەیەک باڵندە گوزەر دەکات بە ئەملاولایاندا بەجێیان ناهێڵێت هەتا دەمرێت و دەکەوێتە خوارەوە. تاوای لێدێت بەرەبابێک کە سەد کەس بووبن، سەرژمێری خۆیان دەکەن دەبینن تا قلبڕ بوون و تەنها یەک پیاویان لێ ماوەتەوە. ئیتر بەچی دەستکەوتێک دڵخۆش بکرێت، یاخود چی میراتێک دابەش بکرێت. لەکاتێکدا ئەمان لەم حاڵەدا دەبن گوێیان لێدەبێت کە بەڵایەکی لەوە گەورەتر دامێنیانی گرتووە. کاتێک جارچی دێتە لایان و هاواریان لێدەکات: دەججاڵ لە دوای خۆیان بەربووەتە ناو ماڵ و منداڵیانەوە. ئەوانیش چییان پێیە هەر هەمووی فڕێدەدەن و ڕوودەکەنەوە ماڵەوە و، دە سوار چاک لە پێش خۆیانەوە دەنێرن. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: من زۆرچاک ناوی خۆیان و باوکیان و ڕەنگ و شێوەی ئەسپەکانیان دەزانم، ئەوان لەو ڕۆژەدا چاکترینی

سواری سەر زەوین، یان لەو ڕۆژەدا لە چاکترین سواری سەر زەوین.

### ٦. جەنگی قوستەنتینیە و ڕزگارکردنی.

ئنجا قوستەنتینیە فەتح دەکات کەوا رسول الله دەفەرمووێت: شارێک ڕوویەک لەئاوە و ڕوویەکی لە وشکانی بەهاوەڵەکانی دەڵێت، دەفەرمووێت: موسڵمانان واتە ئیمامی مەهدی دەچن دەڵێن: لا إله إلا الله وحده لاشريک له والله أكبر. لایەک فەتح دەکرێت. ئنجا بە الله أکبری دووەم لایەکەی تریشی فەتح دەکەن، ئنجا الله سەریان دەخات و فەتحی دەکەن.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (﵁): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "سَمِعْتُمْ بِمَدِينَةٍ جَانِبٌ مِنْهَا فِي الْبَرِّ وَجَانِبٌ مِنْهَا فِي الْبَحْرِ". قَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ الله. قَالَ: "لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَغْزُوَهَا سَبْعُونَ أَلْفًا مِنْ بَنِي إِسْحَقَ، فَإِذَا جَاءُوهَا نَزَلُوا فَلَمْ يُقَاتِلُوا بِسِلَاحٍ وَلَمْ يَرْمُوا بِسَهْمٍ، قَالُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا الله والله أَكْبَرُ، فَيَسْقُطُ أَحَدُ جَانِبَيْهَا -قَالَ ثَوْرٌ: لَا أَعْلَمُهُ إِلَّا قَالَ- الَّذِي فِي الْبَحْرِ، ثُمَّ يَقُولُوا الثَّانِيَةَ: لَا إِلَهَ إِلَّا الله والله أَكْبَرُ، فَيَسْقُطُ جَانِبُهَا الْآخَرُ، ثُمَّ يَقُولُوا الثَّالِثَةَ: لَا إِلَهَ إِلَّا الله والله أَكْبَرُ، فَيُفَرَّجُ لَهُمْ، فَيَدْخُلُوهَا فَيَغْنَمُوا، فَبَيْنَمَا هُمْ يَقْتَسِمُونَ

الْمَغَانِمَ، إِذْ جَاءَهُمُ الصَّرِيخُ فَقَالَ: إِنَّ الدَّجَّالَ قَدْ خَرَجَ، فَيَتْرُكُونَ كُلَّ شَيْءٍ وَيَرْجِعُونَ"[١].

أبو هريره (خوای لیٚ ڕازی بیٚت) دەڵیٚت: پیٚغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەم شارەتان بیستووە کە لایەکی لە وشکانی و لایەکەی تری لە دەریادایە. وتیان: بەڵیٚ ئەی پیٚغەمبەری خوا. فەرمووی: قیامەت هەڵناسیٚت تاوەکو حەفتا هەزار کەس لەنەوەی "إسحاق" لەشکرکیٚشی بۆ دەکەن. کاتیٚک کە بۆی دیٚن دادەبەزن نە بەچەک جەنگ دەکەن و نەتیر دەتەقیٚنن، بەڵکو دەڵیٚن: لا إله إلا الله و الله أكبر، لایەکی تر دەگریٚت. "ثور" دەڵیٚت: من وا دەزانم کەوا فەرمووی، ئەو لایەی کە لە دەریادایە. پاشان دووبارە دەلیٚن: لا إله إلا الله والله أكير، ئەوە لایەکەی تریشی دەگیریٚت. پاشان هەم دیسان بۆ جاری سیٚهەم دەڵیٚن: لا إله إلا الله والله أكبر، ڕیٚگەیان بۆ چۆڵ دەکریٚت و دەچنە ناویەوە و، دەست دەکەن بە کۆکردنەوەی دەستکەوت. لە کاتیٚکدا کە خەریکی دابەشکردنی دەستکەوتەکان دەبن، هاواریٚکیان

---

(١) صحيح مسلم ، كتاب فتن واشراط ساعة.

پێدەگات و دەڵێت: دەجاڵ دەرچوو، ئیتر هەموو شتێک وازلێدەهێنن و دەگەڕێنەوە.

هەروەها لەم فەرموودەیەش باس لە سەرکەوتنەکانی ئیمامی مەهدی دەکات: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (﵁): أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: "لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ الرُّومُ بِالْأَعْمَاقِ أَوْ بِدَابِقٍ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِمْ جَيْشٌ مِنَ الْمَدِينَةِ مِنْ خِيَارِ أَهْلِ الْأَرْضِ يَوْمَئِذٍ، فَإِذَا تَصَافُّوا قَالَتِ الرُّومُ: خَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الَّذِينَ سَبَوْا مِنَّا نُقَاتِلْهُمْ، فَيَقُولُ الْمُسْلِمُونَ: لَا والله، لَا نُخَلِّي بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ إِخْوَانِنَا، فَيُقَاتِلُونَهُمْ فَيَنْهَزِمُ ثُلُثٌ لَا يَتُوبُ الله عَلَيْهِمْ أَبَدًا، وَيُقْتَلُ ثُلُثُهُمْ أَفْضَلُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ الله، وَيَفْتَتِحُ الثُّلُثُ، لَا يُفْتَنُونَ أَبَدًا، فَيَفْتَتِحُونَ قُسْطَنْطِينِيَّةَ، فَبَيْنَمَا هُمْ يَقْتَسِمُونَ الْغَنَائِمَ، قَدْ عَلَّقُوا سُيُوفَهُمْ بِالزَّيْتُونِ إِذْ صَاحَ فِيهِمُ الشَّيْطَانُ: إِنَّ الْمَسِيحَ قَدْ خَلَفَكُمْ فِي أَهْلِيكُمْ، فَيَخْرُجُونَ، وَذَلِكَ بَاطِلٌ، فَإِذَا جَاءُوا الشَّأْمَ خَرَجَ، فَبَيْنَمَا هُمْ يُعِدُّونَ لِلْقِتَالِ يُسَوُّونَ الصُّفُوفَ إِذْ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ (﵇)، فَأَمَّهُمْ، فَإِذَا رَآهُ عَدُوُّ الله ذَابَ كَمَا يَذُوبُ

الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ، فَلَوْ تَرَكَهُ لاَنْذَابَ حَتَّى يَهْلِكَ، وَلَكِنْ يَقْتُلُهُ اللهُ بِيَدِهِ، فَيُرِيهِمْ دَمَهُ فِي حَرْبَتِهِ"(١).

"أبو هريره" (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: قیامەت هەڵناسێت تا ڕۆمەکان لە (أعماق) یا (دابق) دادەبەزن. ئنجا لەشکرێکیان لە مەدینەوە بۆ دەردەچێت کە لە چاکترینی دانیشتوانی سەرزەوین لەو ڕۆژگارەدا. کاتێک ڕیز دەبن، ڕۆمەکان دەڵێن: وازمان لێبێنن با بجەنگین لەگەڵ ئەوانەی کە لە ئێمە بوون و بەدیل گیران [موسڵمان بوون و ئێستا هاتوون دەجەنگن لەگەڵمان] موسڵمانەکان دەڵێن: نەبەخوا وازتان لێناهێنین بجەنگن لەگەڵ براکانمان. ئنجا دەجەنگن لەگەڵیان، سێیەکیان لە جەنگەکە هەڵدێن خوا تەوبەیان لێقبوڵ ناکات. سێیەکیشیان دەکوژرێن کە چاکترینی شەهیدانن لای خوا. سێیەکەکەی تریشیان سەردەکەون، ئەوە هەرگیزا و هەرگیز تووشی فیتنە نابنەوە. ئنجا (قسطنطنیه) ئازاد دەکەن و، لەکاتێکدا کە خەریکی دابەشکردنی دەسکەوت و غەنیمەتی جەنگ دەبن، شمشێرەکانیان بە دارزەیتونەوە هەڵواسیووە. شەیتان بەدرۆ

---

(١) صحيح مسلم

لەناویاندا هاوار دەکات: دەججال دوای ئێوە چووەتە ناو ماڵ و منداڵتان. ئەوانیش دەردەچن، کاتێک ئەوان سەرگەرمی خۆسازدان دەبن بۆ جەنگ، ڕیزەکانیان ڕێك دەخەن قامەت دەکرێت بۆ نوێژ، "عیسا"ی کوڕی "مەریەم" (سەلامی خوای لێ بێت) دادەبەزێت و، پێش نوێژییان بۆ دەکات. کاتێک دوژمنی خوا دەیبینێت، خەریکە دەتوێتەوە وەک چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە. خۆ ئەگەر وازی لێبهێنایە خۆی لە خۆیدا دەتوایەوە تا لە ناودەچوو، بەڵام خوا بەدەستی ئەو دەیکوژێت. خوێنەکەی بە ڕمەکەیەوە نیشانیان دەدات. دوای فەتحی قوستەنتینییە دەججال دەردەچێت.

**ئایا بڕواکردن بە هاتنی کەسێک کەوا نە پێغەمبەرە و نە ملائیکەتی نزیک و نە دینێکی نوێ دەهێنێتە کایەوە گرنگە؟**

یان ناکرێت رسول الله گەلەکەی مولزەم بکات بە هاتنی کەسێکی نادیار لە نەوەی ئادەم نە پێغەمبەرە و نە ملائیکەتە و نە دینێکی نوێ دەهێنێت.

ئەمە گومانی هەندێک کەس و هەندێک لە کەسانی پێشووتریش بووە. وەک محمود غیلان بۆ وەڵامی ئەمە، شێخ حمود بن عبدالله التویجری رحمە، کتێبێکی تایبەتی بەم گومانانە داناوە بەناوی (احتجاج بالآثر علی من انکر المهدی المنتظر).

دانە بە دانە وەڵامی هەموو گومانەکانی داوەتەوە بۆ وەڵامی ئەم گومان و پرسیارەش دەڵێت:

**یەکەمیان:**

كل ما أخبر به رسول الله (ﷺ) من أنباء الغيب مما مضى وما سيأتي فإنه يجب الإيمان به، قال الله تعالى: {وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝٤}.

واتە هەموو ئەوانەی کەوا رسول الله هەواڵی پێداوین لە باسە غەیبییەکان - لەوانەی ڕوویانداوە و لەوانەش ڕوودەدەن - ئیمان هێنان پێی واجبە. چونکە قال الله تعالی: {وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝٤}.

ومن جملة ما أخبر به خروج المهدي في آخر الزمان، فيجب الإيمان بذلك تصديقًا لخبر النبي (ﷺ) كما يجب الإيمان بغير ذلك مما أخبر الصادق المصدوق -صلوات الله

وسلامه عليه- أنه سيكون بعده، ومن آمن ببعض ما أخبر به رسول الله (ﷺ) ورد بعضه، فلا شك أنه فاسد العقيدة، وقد تقدم قول البربهاري أن من أنكر شيئًا من أخبار رسول الله (ﷺ) فإنه متهم على الإسلام، وإنه صاحب هوى مبتدع.

واتە یەکێک لەوانە مەهدی چاوەڕوانکراوە کەوا دەردەچێت لە کۆتا زەمان ئیمانهێنان پێی پێویستە، یان بڕواکردن پێی واجبە. ئەمەش بۆ بە ڕاستگۆ دانانی، هەواڵدانی پێغەمبەر هەروەک چۆن ئیمانهێنان بەشتەکانی تریش واجبە کەوا هەواڵی پێداوین.

هەروەها هەریەک بڕوای بە بەشێک لەو شتانە هەبێت و بڕوای بە هەندێکی تری نەبێت، ئەوە بێگومان عەقیدەیەکی فاسیدی هەیە.

هەروەک ئیمامی بربهاری دەڵێت: هەریەک نکۆڵی لەشتێک لە هەواڵدانی پێغەمبەر بکات، ئەوا تۆمەتبارە لەئیسلامدا و ئەوە خاوەنی بیدعەیە.

**دووەمیان:**

قد ثبت عن النبي (ﷺ) أنه قال: "أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله، ويؤمنوا بي وبما جئت به، فإذا

فعلوا ذلك عصموا مني دماءهم وأموالهم، إلا بحقها وحسابهم على الله"[١].

وهذا الحديث من جوامع الكلم؛ فيدخل فيه جميع ما أمر به رسول الله (ﷺ)، وما نهى عنه، وما أخبر به. فدل على أن من رد شيئا مما أخبر به رسول الله (ﷺ) فإنه حلال الدم والمال، ومن لم يؤمن بالأحاديث الثابتة في المهدي فلا شك أنه داخل في عموم هذا الحديث الصحيح، والله أعلم.

وەڵامی دووەمیش دەڵێت جێگیر بووە لەرسول اللهوە دەفەرمووێت: فەرمانم پێکراوە کوشتاری خەڵکی بکەم تاوەکو دەڵێن لا إله إلا الله و بڕوا بە من بهێنن و، بەو شتەش پێی هاتووم. گەر ئەو شتەیان کرد ئەوا خوێن و ماڵیان لە من پارێزراو دەبێت.

دەڵێت: ئەم فەرموودەیە گشتییە و هەموو ئەو فەرمانانەی رسول الله داویەتی دەچێتە ناویەوە و، ئەوانەشی ڕێگری لێکردووە و ئەوانەشی هەواڵی پێداوین.

بۆیە ئەمە جێگیر دەبێت هەریەک بڕوا بەو هەواڵدانانە نەکات کەوا ڕسول الله پێی داوین، ئەوا خوێن و ماڵی حەڵاڵ دەبێت.

(١) رواه مسلم من حديث أبي هريرة (رضي الله عنه)

هەریەک بڕوای بەو فەرمووده جێگیرانەی رسول الله نەبێت کە لەسەر مەهدی هاتوون، ئەوا بێگومان دەچێتە نێو چوارچێوەی گشتی ئەم فەرموودەیەوە، والله أعلم. واتە مورتەد دەبێتەوە و خوێن و ماڵی حەڵاڵ دەبێت.

**وەڵامی سێیەم:**

گەربێت و یەکێک بانگەوازی مەهدی بکات و پێی وابێت کەوا ئەو مەلائیکەیەکی نزیکە، یان پێغەمبەرێکی نێردراوە، ئەوە پێویستە لەسەر موسڵمانان کەوا شەڕ و کوشتاری بکەن و، بەدرۆی بخەنەوە. چونکە هیچ یەکێک لەم ئیدیعایانە ناکات، جگە لەدرۆزن و دەججالێک نەبێت.

بەهەمان شێوە هەریەک بڵێت من مەهدیم و دینێکی نوێ دادەنێنم، بێگومان واجبە لەسەر موسڵمانان کەوا کوشتار و جەنگی بکەن و، بەدرۆی بخەنەوە. چونکە لەبەرئەوەی هیچ یەکێک نایەت و بڵێت دینێکی نوێم پێیە، جگە لە دەججال و درۆزن نەبێت.

هەروەها بەهەمان شێوە هەریەک بڵێت ئەم دینە کەم کوڕی تێدایە، ئەوە جەنگ و کوشتار و بەدرۆ خستنەوەی واجبە.

سەبارەت بە مەهدی چاوەڕوانکراو کەوا رسول الله هەواڵی پێداوین لەکۆتا زەمان دەردەچێت، بەڕێگایەکی تایبەت و پێشەوایانی سەلەف باسیان لێوەکردووە و لەسەر قورئان و سوننەت و چاکە و دادگەری. هەریەک بێت ئەم سیفەت و وەسفانەی ملائیکەت یان پێغەمبەر بداتە پاڵ مەهدی، ئەوە وتەی ڕەتکراوەیە و قبووڵ ناکرێت.

ئەمە دەقی وەڵامی شێخ حمود بن الله التویجری بوو، کەوا زانایەکی گەورەی سەدەی ڕابردوو بوو. بۆیە ڕەتکردنەوەی فەرموودەکانی مەهدی و بڕوانەکردن پێی زۆر مەترسیدارە، ووریابن.

## گەر مەهدی حەق بێت و هاتنی حەتمی و دڵنیایی بێت، ئەوا هیچ لەئیمان کەم و زیاد دەکات؟

ئەمە گومانێکە لەلایەن بەشێک لە خەڵک و کۆمەڵێک کتێبیشیان نوسیووە، وەک محمود بن غیلان کەوا شێخ حمود وەڵامی داونەتەوە. دەڵێن بڕواکردن بەوەی مەهدی بێت هیچ لەئیمان کەم و زیاد ناکات؟

بۆ وەڵامی ئەم گومانەش حەز دەکەم قسەی زانا نەقڵ بکەم، چونکە گەر لە هەر شتێک خۆم شیبکەمەوە ئەو کات دەڵێن، هەمووی قسەی خۆیەتی. هەروەها منیش وەڵامی شێخ حمودم زۆر پێ نایاب و گونجاو بوو. وەڵامەکەشی بەمشێوەیەیە:

**دیوی یەکەم:**

لا شك أن المهدي حق، وأنه يخرج في آخر الزمان قطعًا، ويملأ الأرض قسطًا وعدلا، كما أخبر بذلك الصادق المصدوق -صلوات الله وسلامه عليه- وقد قال الله تعالى: {وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝٤}.

دەڵێت: هیچ گومان لەوە نییە مەهدی حەقە و، هەروەها لەکۆتا زەمان دەردەچێت و زەوی پڕ لە چاکە و دادگەری دەکات هەروەک چۆن رسول الله الصادق المصدوق -صلوات الله وسلامه عليه- هەواڵی پێداوین. هەروەها قال الله تعالى: {وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝٤}.

**دیوی دووەم:**

لوجه الثاني: أن يقال: إن التصديق بما أخبر به النبي (ﷺ) يزيد في الإيمان وفي صالح الأعمال بلا شك، كما أن التكذيب

بما أخبر به النبي (ﷺ) ينقص الإيمان، وربما أحبط الأعمال الصالحة كلها، وقد تقدم حديث أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله، ويؤمنوا بي وبما جئت به، فإذا فعلوا ذلك عصموا مني دماءهم وأموالهم إلا بحقها، وحسابهم على الله"[١].

هەروەها ڕووی دووەمی دەڵێت: دەڵێین، بەڕاست دانانی ئەوانەی کەوا رسول الله هەواڵی پێداین، واتە (تصديق) بەڕاست دانانی ئیمان زیاد دەکات. هەروەها لەچوارچێوەی کردەوەی چاکی موسڵمانە، بێ هیچ گومانێک کەوا بەدرۆدانانی ئەوانەی کەوا رسول الله هەواڵی پێداوین، لەئیمان کەم دەکەن و، لەوانەیە هەموو کردەوەیەک پووچەڵ بکەنەوە. وەک ئەم فەرموودەی کەوا پێشووتر باسمان کرد، ئەمیش: يث أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله (ﷺ) قال: "أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله، ويؤمنوا بي وبما جئت به، فإذا فعلوا ذلك عصموا مني دماءهم وأموالهم إلا بحقها، وحسابهم على الله"[٢].

---

(١) رواه مسلم

(٢) رواه مسلم

وخروج المهدي في آخر الزمان من أنباء الغيب التي أخبر بها رسول الله (ﷺ)، فمن لم يؤمن بذلك فهو داخل في حكم هذا الحديث الصحيح.

هەروەها دەرچوونی مەهدی لەکۆتا زەماندا لە هەواڵ پێدانە غەیبییەکانە، ئەوەی کەوا رسول الله هەواڵی پێداوین. هەریەک ئیمانی پێ نەبێت ئەم فەرموودە دەیگرێتەوە.

ئنجا شێخ حمود دەڵێت: وەک قەولی ئیمامی ئەحمد کەوا هەریەک فەرموودەی رسول الله ڕەفز بکاتەوە، ئەوا لەلێواری لەنێوچوونە.

هەروەها قسەی ابن شاقلا، هەریەک پێچەوانەی هەواڵێک بێت لە رسول الله کەوا لەسەنەد عەدل لە عەدل، بێ پچڕان گەیشتبن بەیەک، واتە سەنەدی تەواو بێت هیچ تۆمەتێک لەسەر کەسی ناقڵی فەرموودە -واتە ڕاوی- نەبێت، واتە فەرموودەی صەحیح، ئەوا هێرشی بۆ سەر ئیسلام کردووە. ئنجا قەولی ئیمامی بربهاریش دەهێنێت. لەکۆتاییدا دەڵێت: وما أخبر به النبي (ﷺ) من أنباء الغيب فهو من الحق الذي أوحاه الله إليه، فمن صدق به فهو مصدق بالحق، ومن كذب به فهو مكذب

بالحق، ولا فرق في ذلك بين إخباره (ﷺ) عن المهدي، وبين إخباره عن غيره من الأمور الماضية والأمور التي ستقع في آخر الزمان، وما يكون بعد قيام الساعة، فكل ذلك من باب واحد، يجب الإيمان به، ولا يجوز رده ولا رد شيء منه.

هەر هەواڵێک کە رسول الله لەباسە غەیبییەکان هەواڵی پێداوین، ئەوا حەقە و لەو حەقانەیە کەوا بەوەحی هاتووە بۆی. هەریەک بەڕاستی دابنێت ئەوا حەقی بەڕاست داناوە، هەریەک بەدرۆی بخاتەوە ئەوا حەقی بەدرۆ خستۆتەوە، واتە (وەحی).

هیچ جیاوازی نییە لەنێوان ئەم هەواڵانەی کە رسول الله لەسەر مەهدی داویەتی لەگەڵ هەواڵە غەیبییەکانی تری جگە لەمەهدی کەوا لەڕابردوو ڕوویانداوە، یان لەداهاتوو ڕوودەدەن و، ئەوانەی تاقیامەت ڕوودەدەن هەموو ئەوانە لەیەک بابە. بۆیە ئیمانهێنان پێی یان بڕواکردن پێی واجبە و پێویستە. ناکرێت و نابێت ڕەفزکردنەوەی بەهیچ شێوەک. انتهى كلامه.

ئنجا منیش دەڵێم: بێگومان بڕواکردن بە باسی مەهدی لە ئیمان زیاددەکات، چونکە فەرموودەی پێغەمبەرە و بەڕاست

دادەنرێت. هەروەها بڕوا نەکردن پێی مەترسیدارە و ئیمان کەم دەکات و کردەوەش پووچەڵ).

## ئەنجامی کۆتایی

بێگومان لەو دیراسەیەی کەوا لەسەر باسی ئیمامی مەهدی کردم، هەروەها کتێب و ئەقەوالی زانایانی سەلەف و خەلەفیشم دیراسەکرد، ئەمیش ئەوەیە:

- فەرموودەکانی کەوا لەسەر مەهدی هاتوون لەچەندان هاوەڵ و ڕێگای جیاوازەوە هاتوون. هەروەها بە صەحیحی ثابت بوون و، هیچ مەجالی ڕەفزیان تێدا نییە، هەروەک شێخ حمود بن عبدالله لە (احتجاج بالآثر على من أنكر المهدی منتظر) وەڵامی هەموو گومانەکانی داوەتەوە لەسەر ئەم باسە.
- هەروەها فەرموودەکان گەیشتوون بەپلەی متەواتیری مەعنەوی کەوا چەندین زانا ئەم شتەیان دووپاتکردووەتەوە، هەروەک لەسەرەتای کتێب باسم کردووە زاناکان و ناوی کتێبەکانیان.

- باسی مەهدی لەو باسانەیە کەوا رسول الله هەواڵی پێداوین کەوا ڕوودەدەن، واتە باسە غەیبییەکانە. بەمەش قال الله تعالی: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ٣﴾ کەواتە وەحییە و بەهیچ جۆرێک ناکرێت و نابێت بڕوات پێی نەبێت. هەروەها ئیمانهێنان یان بڕواکردن پێی واجبە و پێویستە.
- ڕەتکردنەوەی ئەم باسە، واتە ڕەتکردنەوەی فەرموودەی ثابت و صەحیح، ئەمەش کوفرە. هەروەک (ئیمامی إبن بطة العکبری لە إبانة الصغری)دا هێناویەتی، دەڵێت: ئیمان و بڕواهێنان بە هەواڵەکانی پێغەمبەر واجبە. هەریەک بڕوای بەهەموو فەرموودەکان هەبێت، تەنها یەک دانەی کەوا نێردراوە ڕەفز بکاتەوە ئەوا کافرە بە ئیجماع، ئەمەش زۆر مەترسیدارە. هەروەها شێخ حمود التویجریش ئەوەی هێنا هەریەک ڕەفزی ئەم باسە بکات خوێن وماڵی حەڵاڵە.
- مەهدی چاوەڕوانکراو پێویستە بەوشێوەیە بێت کەوا وەسفکراوە لەلایەن رسول الله، لەلایەنی سیفاتی جەسەدی و، هەروەها نیشانەکانی تری زەمانی وەک ڕووداوەکان و پێش هاتەکان کەوا لەنێو کتێبەکە ئاماژەم پێیداوە.

- مەهدی نە پێغەمبەرە و نە ملائیکەیە، بەڵکو ئەمیر و ئیمامێکە و دەبێتە خەلیفەی موسڵمانان لەکۆتا زەماندا. هەروەها عیسا (عَلَيْهِ السَّلَام) نوێژی لەدواوە دەکات و حەوت تاوەکو نۆ ساڵ حوکم دەکات و، زەوی پڕ دەکات لەدادگەری و چاکە.

**والحمد لله رب العالمين**

## سەرچاوە بەکار هاتووەکان

١- عقد الدرر في أخبار المنتظر.

يوسف بن يحيى بن علي المقدسي الشافعي السلمي.

٢- الاحتجاج بالأثر على من أنكر المهدي المنتظر.

تأليف الفقير إلى الله تعالى/ حمود بن عبدالله بن حمود التويجري.

٣- عقيدة أهل السنة والأثر في المهدي المنتظر.

للشيخ عبد المحسن العباد.

٤- عرف الوردى فى أخبار مهدى المنتظر، حافظ جلالدين سيوطى.

٥- إبانة الصغرى، ابن بطة العكبرى.

٦- تفسير طبرى، تفسيرى إبن كثير، تفسير قرطبى.

٧- خەليفەى داهاتووت بناسە، لێكۆڵەر أبى عبدالله كورستانى.

## کتێبە نوسراوەکانی لێکۆڵەر

تێبینی بۆ ئەوانەی کتێبەکانی لێکۆڵەریان نەخوێندۆتەوە، لە کوێوە دەست پێبکەن؟

کتێبەکانتان بە ڕیزبەندی بۆ دادەنێین، هەروەها لەگەڵیشیدا پێتان دەناسێنین و، ئنجا لینکەکانیشتان لە بەشی دواوەی کتێبەکەوە بۆ دادەنێین. کتێبەکان تا سودییان لێوەربگریت بەم ڕیزبەندییەی خوارەوە بیانخوێننەوە.

### ١- نوری ڕێگا

ئەم کتێبە بەنرخە نوری ڕێگا کتێبێکی عەقیدەیی و بیروباوەڕییە. -ئایا دەتەوێت بزانیت بۆچی و ئامانج لە دروست بویت؟

- ئایا دەتەوێت الله بناسیت و بزانیت کێیە؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت یەکەم فەرمانی الله چی بوو؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت یەکەم کاری پێغەمبەران چی بوو؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت گەورەترین وشە چییە؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت پێناسەی لا إله إلا الله چییە و مەرج و خاڵەکانی ئەم وشەیە چین؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت هەرکەسێک بڵێ لا اله الا الله دەچێتە؟

- ئایا دەتەوێت بزانیت طاغوت چییە و کێیە و کێن و سزای خۆیان و شوێنکەوتووانیان چییە؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت هۆکاری بوون بە طاغوت چییە؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت، شیرک چییە و جۆرەکانی چین و مەترسی ئەم تاوانە چییە و سەرەنجامی بۆ کوێیە؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت، ئەبو جەهل عەقیدەی چۆن بوو؟

ئەمانە هەمووی خاڵ بەخاڵ بەپێی ئایەت واتە هەمووی لەڕێگای قورئانەوە لەگەڵ هەندێک فەرموودەی صەحیحەین.

هەموو ئەوانە لەم کتێبەدا بۆم کۆکردوونەتەوە کەوا بۆ یەکەم جارە کتێبی عەقیدە لەڕێگای قورئان بەقورئان هەبێت و نوسرابێت. بە شێوەی دارِشتن زنجیرە وەک سەرەتای ژیانی مرۆڤ و کۆتا خاڵی مردنی بێت، بەجۆرێک نوسراوە هەست نەکەیت کەوا کتێبێکی ووشک بێت بیخوێنەوە ئنجا بۆخۆت بڕیار بدە.

**٢- علوم القرآن وفضائلها (زانستی قورئان و پلەوپایە و ڕێگاکانی فێربوونی).**

لەم کتێبەدا باسی پلەوپایە و گەورەیی قورئان و ڕێگاکانی فێربوونی بەشێوەیەکی سادە و پوخت کراوە. هەروەها باسی ئەو لقانە کراوە کە لە زانستەکە دەبنەوە و، باسی

ئەوەش کراوە کە لە قورئان چی عیلمێکت دەست دەکەوێت؟ هەروەها لەگەڵ تەفسیری چەند ئایەتێکی زۆر گرنگی قورئان بەکورتی و پوختی.

**٣- علم الحدیث زانستی فەرموودە و ڕێگاکانی فێربوونی.**

لەم کتێبەدا هەوڵدراوە بەشێوەیەکی پوخت و سادە یاخود چەند ڕێگایەکی پوخت و سادە خراوەتەڕوو تاکو لەڕێیەوە بچیتە ناو ئەم زانستە گەورە و قوڵە کە وەکو بەحرێکی گەورە وایە. لەگەڵ ئەوەشدا مێژووی ئەم عیلمە و ئەو زانا گەورانەی کە تێکۆشاون لەم مەیدانەدا باسیان کراوە و، هەورەها ئەو هاوەڵە بەڕێزانەش ناسێنراون کە خزمەتێکی گەورەی ئێمەیان کردووە بە گەیاندنی ئەو حەقەی کە لەسەر شانیان بووە.

**٤- زانستی نیشانەکانی قیامەت**

ئەم کتێبە زۆر پێویست و گرنگە چونکە ئەو باسەی کە دەوروژێنێت زۆر جێی پرسیار و شێواوە لەلای خەڵکی بەجۆرێک کە باسی نیشانەکانی قیامەت دەکەیت، یەکسەر پێت دەڵێن بانگەشە و دەعوە بۆ عیلمی غەیب دەکەیت. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەشارەزایی و پشتگوێخستنی ئەم عیلمە چونکە ئەم عیلمە نیشانەکانی پێش قیامەت بۆ خەڵکی ڕوندەکاتەوە و بەصیرەت و بەرچاوی ڕوونی

بەخەڵکی دەبەخشێت بەتایبەت ئەو فیتنە و گێژاوانەی کە لەپێش کۆتایی دونیادا خەڵکی گیرۆدە دەکات. ئەمەش گەورەیی فیتنەکان دەردەخات. ئەم عیلمە زۆر پشگوێخراوە، حەقی خۆیەتی موسڵمانان گرنگی پێبدەن تاکو خۆیان لە فیتنەکان بپارێزن، چونکە لە نیشانەکانی نزیکبوونەی قیامەت، زۆربوونی فیتنەیە.

ئەم کتێبە باسی کورتەیەک لەسەر چوونە ناو نیشانەکانی قیامەت لەگەڵ چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ نیشانەکان و هەڵوێستمان بەرامبەر ئەو فەرموودانەی کە لاواز (ضعیف)ن چۆن بێت. لەکاتێکدا لە واقیع هاتوونەتەجێ!

**٥- خەلیفەی داهاتووت بناسە**

ئەم کتێبە وەلامی چەند پرسیارێک دەخاتەڕوو کەوا:

- ئایا بۆچی باسی "مەهدی" ئاوا گرنگی پێدراوە؟
- ئایا سیفەتی خودی (شەخصی)یەکانی مەهدی، واتە شێوە و سیفاتی کەسایەتی و لەگەڵ سیفەتە بەدیهێنراوەکانی مەهدی چین؟
- ئایا کەی دەردەچێت و حاڵی جیهان چۆنە پێش دەرچوونی؟

- ئایا ئەو سیفەتە زەمانی واتە کاتی هاتنی و سیفەتە مەکانیەکان واتە شوێنی بوون بە پێشەوایی موسڵمانان چین؟
- ئایا ئەو فەرموودە صەحیحانە چین کە باسی مەهدیان کردووە؟

ئەمانە و چەندین پرسیاری تر لەم کتێبەدا وەڵامی دراوەتەوە و ڕونکراوەتەوە لەڕوانگەی فەرموودەکاندا کە لەسەر مەهدی هاتوون.

### ٦- دەجال بناسە

باسکردنی دەجال لەچوارچێوەی ئایەتی قورئان بە ناڕاستەوخۆ و ئاماژە بۆدانی. هەروەها باسکردنی لە چواچێوەی فەرموودەدا کەوا:

- ئایا دەجال لەنەوەی ئادەمە یان جن؟
- سیفەت و وەسفەکانی دەجال چین؟
- شوێنی دەرچوون و بانگەوازی دەجال لەکوێوەیە؟
- کاتی دەرچوونی دەجال کەیە؟
- ئایا فیتنەی دەجال زۆر مەترسیدار و گەورەیە کە هەموو پێغەمبەران گەلەکانیان لە فیتنەکەی ئاگادارکردووەتەوە؟
- ئەگەر ترسناک و مەترسیدارە ڕێگا چارە چییە و دەبێت چۆن خۆمان لە فیتنەکەی بپارێزین؟

- ئایا ڕوبەڕووی دەجال ببینەوە یان لەدەستی هەڵبێین؟
- ئایا چەند لەسەر زەوی دەمێنێتەوە و هەموو زەوی دەتوانێت بگەڕێت جگە لە چەن شوێنێک نەبێت، ئەو شوێنانە کوێن کە دەجال ناتوانێت تێی بچێت؟
- ئایا دوای دەجال تەوبە قبوڵە و دەرگای تەوبە کراوە دەمێنێت؟

ئەمانە و چەندین پرسیاری تری هەستیار و گرنگ وەڵامدراونەتەوە لە کتێبەکەدا لە ڕوانگەی فەرموودەکانەوە.

## ٧- دابەزینی عیسا علیه السلام

دابەزینی عیسا لە کۆتایی زەمەن و دنیا یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی قیامەت و لە کتێبە عەقیدەییەکانی ئەهلی سونە و جەماعەدا بە بابەتێکی عەقیدەییە دانراوە و باوەڕبوونی پێی بە واجب دانراوە. ئەم کتێبەش لەڕوانگەی قورئان و سوننەت و فەرموودەکاندا بەجوانی و بەبەڵگەوە سەلمێنراوە ئەم هەواڵە گەورەیە کە لەسەر دەستی ئەم پێغەمبەرە کۆتایی بە فیتنەی دەجال دێت.

## ٨- الهجرة-کۆچکردن

ئەم کتێبە باسی هیجرەت و کۆچکردن دەکات و گەورەیی و بەجێگەیاندنی ئەم ئەمرە دەخاتەڕوو و لەگەڵ باسکردنی

کۆچی ئیماندارانی سەردەمی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و کۆچی پێغەمبەرانی پێشوو لەپێناو اللەدا. هەروەها تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە کەی کۆچکردن یاخود هیجرەت واجب دەبێت و چی کاتێکیش کۆتایی دێت.

**٩- شکۆی دین- جهاد في سبيل الله**

ئەم کتێبە بریتییە لە پێشەکییەکی پووخت و وورد لەسەر جیهاد و، پێناسەی جیهاد و، مانا و مەبەستی جیهاد و جۆرەکانی، هەروەها مێژووی جیهادیش باسدەکات. ئنجا پلەوپایەکانی مجاهیدان و شەهید دەخاتەڕوو. پاشان باسی ئەوە دەکات کە چی کاتێک جیهاد واجبە! بە کێ دەوترێت شەهید؟ چی کارێک جیهادە؟ جیهادی کێ بکەین؟ لەگەڵ کێ بین؟ کەی جیهاد کۆتایی دێت؟

ئەمانە و چەند باسێکی تر بە پووختی و وردی باسکراوە. ئنجا قورئان و تەفسیری طبری و إبن كثير و صەحیحی بوخاری و موسلیم تیادا بەکارهێنراوە. هەروەها سونەن ئەبی داود و ترمزی و فتح الباری و منهاجی نەوەوی و چەند شەرحێکی تر بەکارهاتووە. هەروەها ئەو فەرموودانە شەرحکراوە کە پێویستی بە شەرح بووە بەکورتی و پووختی تا لای خوێنەر ڕوونتر بێت.

**١٠- خەونی ئیماندار**

ناميلكەيەكە دەربارەی خەونی ئيماندار، ئەحكام و جۆر و مەترسيەكانی تێدا ڕوونكراوەتەوە كە بەداخەوە زۆرينەی موسڵمان لێی بێ خەبەرن.

بۆ داونلۆدكردنی كتێبەكان سەردانی بەشی دوای ناوەڕۆك بكە.

# ناوەڕۆک

## سەجەمی کتێبەکانی لێکۆڵەر

بۆ داگرتنی هەر کتێبێک دووگمەکەی ژێریەوە دابگرە

### ١ خەلیفەی داهاتووت بناسە

ئەم دووگمەیە دابگرە

### ٢ دەجال بناسە

ئەم دووگمەیە دابگرە

### ٣ زانستی نیشانەکانی قیامەت

ئەم دووگمەیە دابگرە

### ٤ دابەزینی عیسا علیه السلام

ئەم دووگمەیە دابگرە

### ٥ خەونی ئیماندار

ئەم دووگمەیە دابگرە

